Kurdistan Regional Government
Ministry of Education
G.D. of Curriculum & Printings

حکو... عێراق

بەڕێوەبەرا... ...پەمەنییەکان





# بابەتە کۆمەڵایەتییەکان

## بۆ پۆلی پێنجەمی بنەڕەتی







ح... عێراق

بەڕێو... ـەنییەکان



# بابەتە کۆمەڵایەتییەکان

## پۆلی پێنجەمی بنەڕەتی

**ئامادەکردنی**

وەیسی ساڵح حەمەدەمین          عومەر عەلی شەریف

چاپی حەوتەم          ٢٠١٦ز          ١٤٣٧ک          ٢٧١٦ کوردی




نەخشەی هەرێمی کوردستان- عێراق

# بەشی یەکەم

## جوگرافیای سروشتی هەرێمی کوردستان

**هەرێم:** بریتییە لە رووبەرێکی زەوی بەچەند دیاردەیەکی جوگرافی لە هەرێمەکانی دەوروبەری جیادەکرێتەوە.




نەخشەی سروشتی هەرێمی کوردستان

## دیاردە:

هەر شتێک لەسەر گۆی زەوی یا لە ناوەوەی بێت مرۆڤ هەستی پێبکات و کاریگەری لەسەریەوە دەرکەوێت پێی دەوترێت دیاردە.

دیاردە هەیە سروشتییە و هەشیانە مرۆییە، سروشتی وەک (پلەی گەرمی، با، پەستان، مرۆڤ، گیانداران، دەریا و زەریا وچیاودۆڵ.......هتد.

هەرچی دیاردەی مرۆیشە پەیوەندی بە چالاکییەکانی مرۆڤەوە هەیە وەک (کێلگە کشتوکاڵییەکان، ڕێگاوبان، شار و پێکهاتەکانی، کارگە، بەنداو کەناڵی ئاوی و بازرگانی و..هتد.

## کوردستان:

ئەم زاراوەیە لە دوو بڕگە پێکدێت (کورد، ستان).

کورد: ناوی نەتەوەی کوردە، ئاری نەژادە. بڕگەی دووەم پاشگرەکەیەتی، وشەکە تەواو دەکات، مانای نیشتمانە، واتە نیشتمانی کوردان، یا بەو ناوچانە وتراوە کە کوردنشین بوون و ئێستاش کوردنشینن، واتە خاکی کوردان.







وێنەی چەند دیاردەی سروشتی لە کوردستان

## شوێنی کوردستان

ئەو خاکەی ئێستا ئێمە لەسەری دەژین (کوردستانە) دەکەوێتە باشوری خۆرئاوای کیشوەری ئاسیا، رووبەری هەموو پارچەکانی کوردستانی دابەشکراو بە زیاتر لە (٥٠٠٠٠٠)کم٢ دادەنرێت.



نەخشەی کوردستان

**زانیاری:**

کوردستان لە دوای پەیمانی لۆزان لە سالی ١٩٢٣، کە کۆمەڵەی نەتەوەکان سەرپەرشتی دەکرد، بەسەر چوار وڵات دابەش کرا، بەشی رۆژهەڵاتی کە پێشتر لە ژێر دەسەڵاتی وڵاتی ئێران بوو وەک خۆی مایەوە،بەشی باکووری درایە وڵاتی تورکیا و بەشی باشووریش خرایە سەر عێراق و بەشێکی بچوکیشی لە باشوری رۆژئاوا خرایە سەر وڵاتی سوریا.




نەخشەی جیهان

**زانیاری** جیهان لە حەوت کیشوەر پێکدێت، بریتین لە(ئاسیا، ئەفەریقیا، ئەوروپا، ئەمەریکای باکوور، ئەمەریکای باشوور، ئوسترالیا وکیشوەری ئەنتارکتیکا(جەمسەری باشوور).

## سنوری هەرێمی کوردستان:

هەرێمی کوردستان دەکەوێتە بەشی باکوورو باکووری خۆرهەڵاتی عێراق، بەرزاییەکانی حەمرین سنوری باشووری لە هەرێمەکانی تری عێراق جیا دەکاتەوە، لە **بەدرەوە** دەستپێدەکات تا دەربەندی فەتحە کە رووباری دیجلەی پێدا تێدەپەڕێت، لە وێوە لەگەڵ رووباری دیجلە هەڵدەکشێت تا دەگاتە شاری موسل، لە وێشەوە بەرەو رۆژئاوای قەزای **شەنگال** تاسنوری سوریا دەکشێت. لە باکوور تورکیا و لە خۆرهەڵات ئێران، لە باکووری خۆرئاوا وڵاتی سوریایە.




نەخشەی کارگێری هەرێمی کوردستان

## رووبەرو ژمارەی دانیشتوانی هەرێمی کوردستان

رووبەری هەرێمی کوردستانی عێراق نزیکەی (٨٠) هەزار کم٢ ، کەدەکاتە ١٨ ٪ سەرجەمی رووبەری عێراق. ژمارەی دانیشتوانی لە (٥)پێنج ملیۆن کەس زیاترە.

## تایبەتمەندییەکانی هەرێمی کوردستان

١. زۆربەی هەرە زۆری دانیشتوانی هەرێم کوردن، لەگەل کوردیش تورکمان، عەرەب، کلدو ئاشوری و ئەرمەنی دەژین.

٢. لە رووی ئایینییەوە زۆربەی دانیشتوانی هەرێم موسلمانن، بەلام مەسیحی (کریستیان) و ئێزیدیشی تێدایە.

٣. خاکی کوردستان چیا و زورگ و دەشتی زۆری تێدایە، کە هەندێک لە چیاکان زۆر بەرزن.

٤. ئاووهەوای هەرێم لەگەل بەشەکانی تری عێراق جیاوازە، بارانی زۆرترە و پلەی گەرمی نزمترە.

٥. سامانێکی ئاوی زۆری هەیە وەک رووبار و سەرچاوە و تاڤگەکان.



وێنەی چیای سەفین



وێنەی زێی گەورە





**چالاکی:**

ئێمە هەموومان (کورد و عەرەب وتورکمان و کلدۆئاشوری وئەرمەنی) پێکەوە دەژین.یەکترمان خۆشدەوێت، پێکەوە لەپێناو بەرژەوەندییەکانی نیشتمانی کوردستان کاردەکەین.

**مامۆستای بەڕێز:** لە ژێر ڕۆشنایی ئەم دەستەواژەیەی سەرەوە بابەتێک ڕێکبخە، لە تەبایی وپێکەوە ژیان بدوێ.





وێنەی پێکهاتەی دانیشتوانی کوردستان بەجلوبەرگی نەتەوەییانەوە

## ڕاهێنان:

قوتابی خۆشەویست بۆ ئەوەی زانیاریت لەسەر نیشتیمانەکەت زۆرتربێت:-

١. ناوی چەند ڕووبارێکی هەرێم بنووسە.

٢. ناوی چەند شاخێکی بەرزی کوردستان بنووسە.

٣. چەند دەشتێکی بەپیتو فراوانی کوردستان دەستنیشان بکە.

## راهێنان:

پ١: نیشانەی ( √ ) بۆ ڕاستەکان و نیشانەی (x) بۆ چەوتەکان دابنێ.

١. کوردستان ئەو خاکەیە کە زۆربەی دانیشتوانی کوردن.

٢. خاکی کوردستان لە چیاو زورگ و دەشت پێکدێت.

٣. ئاووهەوای هەرێمی کوردستان هاوشێوەی بەشەکانی تری عێراقە.

٤. لەگەڵ نەتەوەی کورد لە هەرێمی کوردستان نەتەوەی تریش هەن.

٥. کوردستان سامانی ئاوی زۆرە.

پ٢: سنوری هەرێمی کوردستان لەگەڵ وڵاتانی دەوروبەریدا دیاری بکە.



وێنەی چەند دیمەنێکی کوردستان



## بەشی دووەم
# رووی زەوی هەرێمی کوردستان

هەرێمی کوردستان لە رووی پێکهاتەی زەوییەوە دیاردەی هەمەجۆر لە بەرزی ونزمی لەخۆ دەگرێت.

### یەکەم:ناوچەی شاخاوی

رووبەری ناوچەی شاخاوی رێژەی (٢٥ ٪) رووبەری هەرێم پێکدەهێنێت، بەرزایی چیاکانی ناوچەی شاخاوی لە نێوانی (١٥٠٠-٣٦٠٠)م بەرزترە. بەسەر دوو زنجیرە چیادا دابەش دەکرێن.




نەخشەی رووی زەوی هەرێمی کوردستان - عێراق

### أ-زنجیرە چیای باکوور (شاخە بەرزەکان):

بەدرێژایی سنوری هەرێم لەگەڵ وڵاتانی تورکیاو ئێران درێژ دەبێتەوە، گرنگترین چیای ئەم زنجیرەیە بریتین لە (ئاشێنە، شەرانش، زۆزان، مەتین، شیرین، حەساری رۆستێ، قەندیل و هەورامان... هتد.

بەرزترین لوتکەی ئەم زنجیرەیە (لوتکەی هەڵگوردە دەکەوێتە چیای حەساری رۆستێ، بەرزییەکەی ٣٦٠٧مەترە).



لوتکەی هەڵگورد

### ب. زنجیرە چیای باشوور (شاخە نزمەکان):

ئەم زنجیرەیە دەکەوێتە باشووری خۆرئاوای زنجیرە چیای باکوور، بەرزاییان لە زنجیرەی باکوور کەمترە، گرنگترین چیاکانی ئەم زنجیرەیە بریتین لە (چیای بێخێر، سپی، ئاکرێ، سەفین، هەیبەت سولتان، بەمۆ، گڵەزەرد و قەرەداغ...هتد).



چیایی خانزاد



چیا نزمەکان (باواجی)

**راهێنان:**

**١. ناوی هەندێک چیای زنجیرەی باکوور(شاخە بەرزەکان) بنووسە.**

**٢. پێکهاتەکانی رووی زەوی هەرێمی کوردستان چەند بەشێکن، ناوی دووانیان بژمێرە.**

**٣. بەرزترین لوتکە چیا لە هەرێمی کوردستان کەوتۆتە کوێ؟بەرزییەکەی چەندە؟**

## گرنگی ناوچەی شاخاوی





١. ساڵانە بەفرو بارانی زۆری لێدەبارێت، دەبێتە سەرچاوەی ئاوی سەرزەوی و ژێر زەوی.
٢. بەهۆی هەڵکەوتەی سروشتی و فێنکی ئاووهەواکەی لە هاویندا بۆتە شوێنی گەشتو گوزار و هاوینەهەوار.
٣. زۆری رووەکی خۆرسک و گژوگیا وای کردوە ببێتە لەوەرگا بۆ بەخێوکردنی مەڕومالاَت.
٤. بەسامانی کانزا سروشتییە جۆراو جۆرەکان دەوڵەمەندە، بەتایبەتی نەوت کە لە سەردەمی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە کێڵگەی(تاوکی)زاخۆ دۆزرایەوە.
٥. ناوچەیەکی گرنگە بۆ بەرهەمهێنانی بەروبوومی کشتوکاڵی.





## دووەم:ناوچەی زوورگ (ناوچەی بان و گرد)



رووبەری ئەم ناوچەیە ڕێژەی (٧٥٪)ی رووبەری هەرێمی کوردستان پێکدەهێنێت.دەکەوێتە باشوورو باشووری خۆرئاوای ناوچەی شاخاوی. بێجگە لە زوورگ ئەم ناوچەیە چەند بەرزاییەکی تێدایە، بەناوبانگترینیان بەرزاییەکانی (حەمرین، مەکحول، شەنگال، مەقلوب و کانی دووملان.....هتد).



### گرنگی ناوچەی زوورگ

١. سامانێکی زۆری نەوتی تێدایە بەتایبەتی ناوچەکانی (کەرکوک، نەینەوا، هەولێر وگەرمیان).
٢. بەهۆی بوونی چەندین دەشتی بەپیتی فراوان وەک (دەشتی حەمرین، دەشتی سلێڤانی، دەشتی هەولێر و دەشتی شەنگال)بەناوچەیەکی گرنگی چاندنی دانەوێلە (گەنم و جۆ)دادەنرێت.
٣. لەبەر زۆری گژوگیا بۆتە لەوەڕگایەکی فراوان بۆ بەخێوکردنی مەڕومالاَت.



## راهێنان:

ئەم بۆشاییانە بە وشەی گونجاو پڕبکەرەوە:-

١. بەناوبانگترین بەرزاییەکانی ناوچەی زوورگ بریتین لە.........و..............

٢. زۆرترین چاڵە نەوتییەکانی کوردستان دەکەوێتە..........و.........و.........

٣. مەڕومالات لەناوچەی............... بەخێودەکرێت.

٤. گژوگیا سامانێکی گرنگە بۆ بەخێوکردنی............ لەناوچەی زوورگ.

٥. ناوچەی زوورگ چەندین دەشتی گەورەی تێدایە وەکو.....، ........، .......





### چالاکی

**مامۆستای بەڕێز: ئەم پشکنین وگەڕانەی کە ئێستا لە هەرێم دەکرێت بۆ دۆزینەوەی سامانی نەوت لە کوردستان بۆ قوتابییەکان روونبکەرەوە.**

**ناوی چەند کێڵگەیەکی نەوتی کە لە سەردەمی دەسەڵاتی خۆماڵی (هەرێمی کوردستان) وەبەرهێندراون. بۆ قوتابییەکان بخەڕوو.**

بەشی سێیەم

## ئاو و هەوای هەرێمی کوردستان

ئاو و هەوای هەرێم بەگشتی لەزستاندا سارده و بارانـاوییه و بەهاوینیش گەرم و ووشکه، ماوەی هەردوو وەرزی زستان و هاوین درێژە.پلەی گەرمی لە بەهار و پایزدا مامناوەندییە.

### ئاو و هەوا لە وەرزی زستاندا:

زستـانی کوردستـان سارده و بـاران و بەفر بارینی زۆره، بەڵام هەندێ ساڵ گۆڕانی بەسەردا دێت، شەو درێژه و ڕۆژیش کورتـه، پـلـەی گـەرمی لـەم وەرزەدا نزم دەبێتـەوە، لـه نـاوەڕاستی وەرزەکه دەگاته پلەی بەستن.







**زانیاری**

**باران بارین لە هەرێمی کوردستان لە کۆتایی مانگی ئەیلول دەست پێدەکات تا کۆتایی مانگی مایس. زۆرترین ڕێژەی باران بارین لـە مـانگـەکانی کانونی یەکەم و دووەمی هەموو ساڵێ دەبارێت، لە ناوچە شاخاوییەکانیشدا بەفر دەبارێت، کە دەبێتە سەرچاوەی سەرەکی ئاوی ژێرزەوی و سەرزەوی.**

### ئاووهەوای هەرێمی کوردستان لەوەرزی هاویندا:

هاوینی هەرێمی کوردستان پلەی گەرمی بەرزە و ووشکەو(بێ بارانە) رۆژ درێژە و شەویش کورتە، پێچەوانەی وەرزی زستانە. بەڵام ناوچە شاخاوییەکان بەگشتی فێنکە، بەتایبەتی (کوێستانەکان)، بۆیە ئەم ناوچانە بوونەتە هاوینە هەوار، هەرچی بەشەکانی باشووری هەرێمە (گەرمیان و گەرمەسێر) لەهاویندا گەرمە.





### راهێنان:

نیشانەی ( √ ) راست بۆ دەستەواژە راستەکان و ( x ) چەوت بۆ چەوتەکان دابنێ.

١. سەرەتای دەستپێکردنی باران بارین لە هەرێمی کوردستان لە مانگی مایس دەستپێدەکات.

٢. لە هاویناندا شەو درێژە و رۆژ کورتە.

٣. ئاووهەوای هەرێم لە زستاناندا ساردە و بارانادوییە، لە هاویناندشدا گەرم و ووشکە.

٤. باران هەموو ساڵێک وەک یەک دەبارێت.

### چالاکی

باران بارین هەموو ساڵێک وەک یەک نابارێت کەمی و زۆری تێدەکەوێت، کاریگەری زۆر دەکاتە سەر کەم و زۆری بەرهەمی کشتوکاڵی و سەرچاوەکانی ئاو.

**مامۆستای بەرێز:-**

ئەم دەستەواژەیە بۆ قوتابییەکان رونبکەرەوە و گفتوگۆی لەسەر بکە.

## هاوینە هەوار:

ئەوشوێنانەن کە هاوولاتیان بۆ خۆ رزگارکردن و حەسانەوە لە گەرمای هاویندا سەردانی دەکەن وەک (دوکان، بێخاڵ و سۆلاف).

## هەرێمەکانی ئاو و هەوای هەرێمی کوردستان

ئاو و هەوای هەرێمی کوردستان دەکرێت بە دوو بەشەوە:

١. هەرێمی ئاو و هەوای دەریای ناوەڕاست: ئەم هەرێمە زستانی سارده و بە باران و بەفرە و هاوینیشی فێنکە. ئەم هەرێمە ناوچە شاخاوییەکانی هەرێمی کوردستان دەگرێتەوە.

٢. هەرێمی ئاو و هەوای گەرمەسێر: ئەم هەرێمە دەشتایی و زوورگەکان دەگرێتەوە، زستانی مامناوەندی و بارانیشی کەمترە لە هەرێمی دەریای ناوەڕاست، هاوینیشی ووشک و گەرمە. لەم هەرێمەدا کورتە گیای لێدەڕوێت. بۆیە پێی دەوترێت (هەرێمی ئاووهەوای گەرمەسێر) چونکە زستان زۆر ساردنییە و هاوینی زۆر گەرمە.



دەریاچەی دوکان



بێخاڵ



سۆلاف

**زانیاری**

**ئاو و هەوای هەرێمی دەریای ناوەڕاست: زاراوەیەکە بەو ناوچانە دەوترێت کە جۆری باران بارین و پلەی گەرمی و بایەکانی لە ناوچەکانی ژێر کاریگەری دەریای ناوەڕاست دەکات.**

**دەریای ناوەڕاست (دەریایێکە دەکەوێتە نێوان هەرسێ کیشوەری ئاسیا، ئەفریقیا وئەوروپا).**

## راهێنان:

ئەم بۆشاییانە پڕبکەرەوە:

١. باران لە هەرێمی کوردستان لەوەرزی..................نابارێت.

٢. لە وەرزی زستاندا پلەی گەرمی...........

٣. هاوینانی هەرێمی کوردستان شەوی...... و ڕۆژی...........

٤. ئاووهەوای هەرێمی گەرمەسێر زستانی.........وهاوینی.........

## چالاکی

**باران بارین لە ناوچە شاخاوییەکان زۆرتر دەبارێت نەک لە ناوچە دەشتاییەکان.**

**مامۆستای بەڕێز:**

**هۆی جیاوازی ڕێژەی باران بارین لەم دوو ناوچەیە بۆ قوتابیان ڕوونبکەرەوە.**





## زانیاری

**ڕەگەزەکانی ئاووهەوا بریتین لە:**

**پلەی گەرمی، شێ (باران، بەفر، تەزرە، هەور، هەڵم، شەونم و زوقم)پەستان و بایەکان.**

## بەشی چوارەم

# رووەکی خۆڕسک

**رووەکی خۆڕسک:**- ئەو رووەکانە دەگرێتەوە کە لە خۆیانەوە بەبێ دەسکاریکردنی مرۆڤ دەڕوێن بەڵام کارلێکردنی نێوان ئاووهەوا و رووی زەوی و خاک دەبێتە جیاوازی پەیداکردن لە دابەشبوونی هەرێمەکانی رووەکی خۆرسک.بۆیە هەرێمەکانی رووەکی خۆرسک لە (هەرێمی کوردستان) بەسەر دوو ناوچە دابەش دەبێت.


رووەکی خۆڕسکی ناوچەی شاخاوی

**١. هەرێمی رووەکی خۆرسکی ناوچەی شاخاوی:** ئەم رووەکانە لە بەشی باکوورو باکووری خۆرهەڵاتی هەرێمی کوردستان (ناوچەی شاخاوی)دەڕوێن.رووەکەکان لە شێوەی دارستانی چڕ دیاردەکەون.رووەکەکانیش وەکو (داربەڕو، سنەوبەر، چنار، گوێز، گێوژ، مازوو، دارەبەن وسماق..تد)داری بەڕووش لە هەموو دارەکانی تر زۆرتر بەرچاو دەکەون.


هەرێمی کورتەگیای خۆرسک

**٢.هەرێمی کورتەگیای خۆڕسک:**- ئەم رووەکانە لە جۆری کورتە گیا لە ناوچەی زوورگ و دەشتەکان بە دیاردەکەون، بەتایبەتی دوای باران بارین لە کۆتایی وەرزی زستان سەرەتای وەرزی بەهار.

**زانیاری:-**

**هۆی کەمبوونەوەی دارستانەکانی کوردستان دەگەڕێتەوە بۆ سێ هۆ:**


داری بەڕوو

١. دەستی تێکدەرانە و سیاسەتی رژێمە شەڕخوازەکانی پێشوی عێراق کاریگەری زۆری هەبووە بۆ لە ناوبردنی سامانی رووەکی خۆڕسک، بۆیە تا ئێستا ئەم سامانە گرنگە نەیتوانیوە زیانەکان قەرەبۆ بکاتەوە.
٢. کەم و زۆری رێژەی دابارین کە کاریگەری زۆری کردۆتە سەر رووەکی خۆڕسک.
٣. بڕینی لە رادەبەدەری دارو درەختەکان لە لایەن دانیشتوانەوە.

### گرنگی رووەکی خۆرسک:

١. خاک لە رووتانەوەو رامالّین دەپارێزێت.
٢. وەک سوتەمەنی بەکاردەهێنرێت، بۆ خۆ گەرمکردنەوە و چێشت لێنان.
٣. سوود لە (بەری) هەندێکیان وەردەگیرێت چ بۆ خواردن یا بۆ دروستکردنی دەرمان.
٤. بۆ دروستکردنی کەلوپەلی ناومالّ بەکاردەهێنرێت.
٥. دیمەنێکی سروشتی جوان بەژینگەی هەرێم دەبەخشێت.
٦. سوودی پزیشکی هەیە وەک بەرهەمهێنانی داو دەرمان.



### چالاکی:

کاتێ دەچین بۆ سەیران پێویستە پارێزگاری لە دارستانەکان بکەین ولقی دارەکان نەشکێنین ویاریان پێنەکەین، ئاگریان لە ژێر نەکەینەوە، چونکە دارستانەکان سامانی نیشتمانی و هۆکاری سەرەکی جوانکردن و پاک راگرتنی ژینگەی کوردستانن.

### راهێنان:

١.لە داری دارستانەکان چ جۆرە کەل و پەلێکی ناومالّ دروستدەکرێت.
٢.ناوی بەری سێ رووەک بلّێ کە بخورێت.
٣.کە چوویت بۆ سەیران چۆن پارێزگاری لە درەختەکان دەکەیت.
٤.هەندێ لە رووەکەکانی کوردستان هەردەم سەوزن، ناوی دووانیان بنووسە.

## بەشی پێنجەم

# سەرچاوەکانی ئاو لە هەرێمی کوردستان

**کوردستان لە رووی سەرچاوەکانی ئاو دەوڵەمەندە، بەهۆی هەڵکەوتەی شوێنی جوگرافی هەرێم و بەرزی ونزمی خاکەکەی.**

سەرچاوەکانی ئاوی کوردستان بەسەر سێ شێوە دابەشدەکرێت:

**١.باران و بەفر ٢.ئاوی سەر رووی زەوی ٣.ئاوی ژێر زەوی**

### ١.باران و بەفر:



باران و بەفر بەسەرچاوەی سەرەکی سامانە ئاوییەکان دادەنرێت وەک (رووبار و دەریاچە و کانیاو).چونکە لە کوردستان ساڵانە لە وەرزی زستاندا باران و بەفرێکی زۆر دەبارین، لە وەرزی پایز و بەهاریش باران دەبارێت.

### ڕاهێنان:

**سوودەکانی باران بارین و بەفر چییە؟**

**بۆ(مرۆڤ، ئاژەڵ، کشتوکاڵ، زەوی، ئاوی رووبار و چەم و بیر و کانیاو).**

### ٢.ئاوی سەر رووی زەوی:-



رووباری خابوور(زاخۆ)

کوردستان بە ئاوی سەر رووی زەوی دەوڵەمەندە، چونکە رووباری دیجلە بە هەرێمی کوردستاندا تێدەپەڕێت، هەر پێنج لقەکانی دەڕژێتە سەر وەک(زێی خاپور، زێی گەورە، زێی بچوک، زێی ڕۆخانە (عوزێم)وزێی سیروان (دیالە)، جگە لە گەڵێک سەرچاوەی کانیاو لە ناوچە جیاجیاکانی هەرێمی کوردستان.

**٣.ئاوی ژێرزەوی:** بریتیە لە ئاوی ئەو باران و بەفرە تواوەی کە بەناخی زەویدا دەچێتە خوارەوە لە چینەکانی ژێرزەوی گلدەخواتەوە و کۆدەبێتەوە.بە دوو ڕێگا دێتەوە سەر زەوی، بەشێوەی سروشتی وەک (کانیاو سەروچاوەکان) یا بەهۆی دەسکاری مرۆڤەوە وەک (بیرو کاریز).



نەخشەی سەرچاوە ئاوییەکان

**زانیاری:-**

کەمی باران و بەفر بارین لە ناوچەی شاخاوی کاریگەری زۆری لەسەر ئاوی ژێرزەوی هەیە، چونکە ئەو درز و قلیشانەی رووی زەوی هەرێم ئاوێکی زۆر بەناو ناخیدا دەچێتە خوارەوە، سامانی ئاوی ژێرزەوی پێکدەهێنێت.

**پرۆژە گرنگەکانی دەست بەسەرداگرتن و ئاوگلدانەوە لە هەرێمی کوردستان:**

١.بەنداوی دوکان:- لەسەر زێی بچوک دروستکراوە لە پارێزگای سلێمانی.توانای گلدانەوەی (٦,٨)ملیار م٣ ئاوی هەیە.

٢.بەنداوی دەربەندیخان:- لەسەر زێی سیروان (دیالە) دروستکراوە.توانای گلدانەوەی (٣)ملیار م٣ ئاوی هەیە.

٣.بەنداوی حەمرین:- لەسەر زێی سیروان (دیالە) لە پارێزگای دیالە دروستکراوە.توانای گلدانەوەی (٢,٥-٣,٢)ملیار م٣ ئاوی هەیە.


بەنداوی دوکان

٤.بەربەستی دوبز: لەسەر زێی بچوک لە پارێزگای کەرکوک دامەزراوە.بۆ مەبەستی بەرزکردنەوەی ئاستی ئاوی زێی بچوکە تا بە ئاسانی ئاو بگاتە جۆگەکانی ژوور بەربەستەکە کە لەمبەر و لەو بەری رووبارەکە لێدراون بۆ ئاودێری.

٥. بەنداوی ئاسکی موسل:لەسەر زێی دیجلە لە پارێزگای نەینەوا دروستکراوە.توانای گلدانەوەی (٨,٧)ملیار م٣ ئاوی هەیە.

### سوودەکانی بەنداو:ـ

١. بۆ بەرهەمهێنانی ووزەی کارەبا.
٢. بۆ گەشتوگوزار و سەیران.
٣. بۆ دوورخستنەوی شارەکان لە مەترسی لافاو.
٤. بۆ گلدانەوەی ئاو و بەکارهێنانی لە ئاودێری کشتوکاڵ.
٥. بۆ بەخێوکردنی سامانی ماسی.



بەنداوی دەربەندی خان

## راهێنان:

**پ١: نیشانەی ( √ ) بۆ ڕاستەکان و نیشانەی (x) بۆ چەوتەکان دابنێ.**

**١. کوردستان سەرچاوەی ئاوی سەر رووی زەوی کەمە.**
**٢. بەنداوی دوکان لەسەر زێی گەورە دروستکراوە.**
**٣. دروستکردنی بەنداو تەنها بۆمەبەستی بەرهەمهێنانی وزەی کارەبایە.**
**٤. زێی ڕۆخانە لە ناو هەرێمی کوردستان هەڵدەقوڵێ.**

**پ٢:ـ ئەم بۆشاییانە پڕبکەرەوە:**

**١. بەربەستی دووبز لەسەر زێی.......... دروستکراوە.**
**٢. باران گرنکی زۆری هەیە بۆ.................لە وەرزی زستاندا.**
**٣. بەنداوی............... لەسەر رووباری دیجلە دروستکراوە.**
**٤. سەرچاوەی ئاوی ژێرزەوی وسەرزەوی لە............ پەیدا دەبێت.**

### چالاکـــی:ـ

**لە کاتی باران بارین لە وەرزی زستاندا شارەکەت دووچاری چ گرفتێک دێت ؟.**

بۆ پاراستنی ژینگەکەت هەوڵبدە لەگەڵ هاوڕێکانت کەم وکوڕیەکان و گرفتەکان دیاری بکەن، ڕێگا چارەیان بۆ بدۆزنەوە.

## بەشی شەشەم
## جوگرافیای مرۆیی
## دانیشتوانی هەرێم و شارە گرنگەکانی

### دانیشتوان:ـ


وێنەی گوندێک

دانیشتوانی هەرێمی کوردستان زیاتر لە پێنج ملیۆن کەسە، لە شار وشارۆچکەو گوندی پارێزگاکانی (هەولێر، سلێمانی، کەرکوک، دهۆک وبەشێک لە پارێزگای موسل ودیالە) نیشتەجێبوون.

دانیشتوانی شارەکان بەکار و پیشەی جۆراوجۆر وەک (بازرگانی، پیشەسازی، کاری دەستی، جگە لە کارکردن لە دامو دەزگاکانی میری)خەریکن.


هەولێر

### شارە گرنگەکانی هەرێمی کوردستان

#### هەولێر:ـ

شارێکی مێژوویی بەناوبانگە و پایتەختی هەرێمی کوردستانە، دانیشتوانی لە ملیۆنێک کەس زیاترە. کەوتۆتە دەشتێکی فراوان و ناوەندی کارگێڕی و دامودەزگای حکومەتی هەرێمی کوردستانە، بە بازرگانی و پیشەسازی و بەروبوومی کشتوکاڵی وەک (گەنم وجۆ وبەخیوکردنی مەڕومالاَت) بەناوبانگە.لەم ساڵانەی دوایش نەوتێکی زۆری لێدۆزراوەتەوە کە پێگەی ئابووری هەولێر و کوردستانی گرنگ کردووە.گەلێ شوێنەواری مێژووی تێدایە وەک قەلاَو منارەو گردی قالیچ ئاغا.


هەولێر

## سلێمانی:ـ

شارێکی گرنگی کوردستانە، دەکەوێتە بەشی خۆرهەڵاتی هەرێم، ژمارەی دانیشوانەکەی نزیکەی ملیۆنە کەسێکە. مەڵبەندێکی گرنگی بازرگانی و کشتوکاڵی وپیشەسازی و رۆشنبیری و کارگێڕییە. بەکانزای هەمەجۆر بەناوبانگە و چەندین کارگەی بەرهەمهێنانی چیمەنتۆی لێدامەزراوە وەکو (کارگەی چیمەنتۆی بازیان و تاسلوجە). بە چەندین دەشتی بە پیت بەناو بانگە وەکو دەشتی شارەزوور و رانیە کە بە بەرهەمهێنانی دانەوێڵە و گوڵەبەرۆژە و میوەی جۆراو جۆر بەناوبانگن. ئێستاش بە پایتەختی رۆشنبیری هەرێمی کوردستان دادەنرێت.






## کەرکوک:ـ

شارێکی دێرینە و مەڵبەندێکی ئابووری زۆرگرنگە، دەوڵەمەندترین ناوچەی بەرهەمهێنانی نەوت و گازی سروشتییە لە کوردستان وعێراق، زۆربەی دانیشتوانەکەی کوردن، تورکمان و عەرەب و کلدو ئاشوری تێدا دەژیت.دەشتی کەرکوک دەکەوێتە ئەم پارێزگایە کە دەشتێکی فراوان و بەپیتە بە بەرهەمهێنانی گەنم وجۆ ولۆکە بەناوبانگە.






**دهۆک:ـ**

شارێکی گرنگ وشوێنی جوگرافیای لەباری هەیە، لەبەرئەوەی لەسنوری تورکیا نزیکە بۆتە دەروازەی هەرێم وعێراق بۆبازرگانی لەگەڵ تورکیا و وڵاتانی دەرەوە.بەناوچەیەکی گەشتیاری گرنگ دادەنرێت کە ساڵانە گەشتیاران رووی تێدەکەن.لەرووی کشتوکاڵیشەوە بە بەرهەمهێنانی میوەی هەمەجۆر بەناوبانگە.







زانیاری:-

حکومەتی هەرێم بۆ ئاوەدانکردنەوەی گوندەکان و زیادکردنی بەرهەمی کشتوکاڵی و سامانی ئاژەڵ پێشینەی دارای دەدات بە گوندنشینەکان.

## راهێنان:

**پ١: نیشانەی ( √ )بۆ راستەکان و نیشانەی (x) بۆ چەوتەکان دابنێ.**

١.حکومەتی هەرێمی کوردستان یارمەتی ئاوەدانکردنەوەی گوندەکانی داوە.

٢.شاری کەرکوک بەکانزای نەوت بەناوبانگە.

٣.لەسەردەمی رژێمی بەعس زۆربەی هەرە زۆری گوندەکان بەرهێرشی تێکدەرانە کەوتن.

٤.شارەکانی کوردستان بازاڕی کڕین و فرۆشتنی بەروبوومی کشتوکاڵی خۆماڵییە.

پ٢ :ـئەم بۆشاییانە پڕبکەرەوە...

١............ پایتەختی هەرێمی کوردستانە.

٢.شاری کەرکوک بە............دەوڵەمەندە.

٣.دهۆک کەوتۆتە نزیک سنووری..............

٤.هەڵەبجە دەکەوێتە پارێزگای............ وبەرهێرشی کیمیا باران کەوتووە، کەلەلایەن رژێمی پێشوی عێراق دژی گەلی کورد بەکارهێنرا.




نەخشەی کارگێڕی عێراق

## چالاکی:ـ

ئەم شارانە بخە سەرنەخشەی عێراق:
(سلێمانی، کەرکوک، هەولێر، دهۆک، دیالە، موسل).

## زانیاری:ـ



لەدوای راپەرینە مەزنەکەی گەلی کوردستان لە ساڵی ١٩٩١ هەرێمی کوردستان ئاوەدانکردنەوەو گەشەکردنی زۆری بەخۆوەبینیوە لە دروستکردنی رێگاوبان و پرد و باڵەخانەو تەلارو دەزگاکانی خوێندن و نەخۆشخانەو ئاوەدانکردنەوەی دێهاتەکان.

### یەکەم/کشتوکاڵ:

بە پیشەی سەرەکی دانیشتوانی هەرێمی کوردستان دادەنرێت، لە دێر زەمانەوە پێیەوە خەریکبوونە، کوردستان مەڵبەندی دەرکەوتنی پیشەی کشتوکاڵی و مرۆڤی لێ نیشتەجێبووە، ئاووهەواکەی گونجاوە و خاکی بەپیتی زۆرە، (گوندی چەرمۆ) یەکێکە لە دیاردە هەرە زەقەکان کە تا ئێستا شوێنەواری ماوە، دەکەوێتە رۆژهەڵاتی پارێزگای کەرکوک هەر لێرەوەش ئەم پیشەیە بەناو جیهاندا بڵاوبۆتەوە.

**کشتوکاڵ ئەم بەشانەی خوارەوە دەگرێتەوە:-**

**١.بەروبوومی رووەکی:**

ئاو و هەوای کوردستان و بەرزی و نزمی و جۆری خاکەکەی و زۆری ئاوی سەرزەوی و ژێرزەوی و شارەزایی مرۆڤی کورد، هۆکاری سەرەکی بەرهەمهێنانی هەمەچەشنەی بەروبووم بووە لە هەرێمی کوردستان.

**گرنگترین بەروبوومە کشتوکاڵییەکان ئەمانەن:-**

**١. دانەوێڵە:**

أ.گەنم / بەروبوومێکی زستانەیە لە کۆتایی وەرزی پایز دەچێنرێت، وەرزی دروێنەش لە کۆتایی مانگی ئایار و سەرەتای مانگی حوزەیران دەستپێدەکات.



چاندنی گەنم وجۆ بەشێوەی (دێمی)واتە پشت بەباران دەبەستێت لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان، زۆری وکەمی دابارین کاریگەری لەسەر رێژەی داهاتی بەروبووم هەیە. لە ساڵەکانی(٢٠٠٦-٢٠١٢)زیانێکی زۆر بەر جوتیاران کەوت لە ئەنجامی وشکەساڵی کە بەشێوەیەکی ترسناک هەرێمی گرتۆتەوە.

لە هەرێمی کوردستان چەندەها جۆر گەنم دەچێندرێت وەک (قەندەهاری، رەشگوڵ، گوڵ رووت، مەکسیپاک، بەهارە..تد)

**ب.جۆ/** هەمیشە گەنم وجۆ پێکەوە ناودەبرێن، بەروبوومێکی زستانەیە وەک گەنم لە کۆتایی وەرزی پایز دەچێنرێت و لە کۆتایی وەرزی بەهار دروێنە دەکرێت.ئەو جیاوازییەی کە جۆ

لەگەڵ گەنم هەیەتی، جۆ بەرگەی کەمبارانی دەگرێت و لە خاکی کەم پیت و سوێریش گەشەدەکات، خۆراک و ئالیکی ئاژەڵە، دەچێتە ناو هەندێک پیشەسازی.



گەنم



دروێنە

## راهێنان:

پ١:ـ وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە.

١.سەرچاوەی سەرەکی خۆراکی رۆژانەمان چییە ؟

٢.سوودەکانی گەنم و جۆ چییە؟

٣.ئالیکی ئاژەڵ پشت بەچی دەبەستێت ؟

پ٢:ـ ئەم بۆشاییانە پڕبکەرەوە...

١. گەنم و جۆ بەروبوومی........لە کۆتایی وەرزی.......دەچێنرێت و لە کۆتایی وەرزی......... دروێنە دەکرێت.

٢. چەندین جۆر گەنم هەیە وەک..........و.........و...........

٣. جۆ بەخۆراکی سەرەکی.........................دادەنرێت.

### زانیاری:ـ

هەرێمی کوردستان چەندین دەشت لە خۆ دەگرێت وەک (دەشتی حەمرین، شارەزوور، دەشتی هەولێر، بیتوێن، سندی....تد

**ج.چەڵتوک (برنج)**/بەروبوومێکی هاوینەیە پێویستی بە پلەی گەرمی بەرز و ئاوی زۆر هەیە.بە خۆراکی سەرەکی دانیشتوانی هەرێمی کوردستان و عێراق دادەنرێت.مەرەزەکردن لە هەرێمی کوردستان لە بازیان وئاکرێ و هەریرو چەندین جێگای تر دەکرێت.



کێڵگەی گەنمەشامی

**د.گەنمەشامی /** بەروبوومێکی هاوینەیە، دووجۆری هەیە (سپی و زەرد)لە زۆربەی پارێزگاکانی هەرێم بەرێگای ئاودێری دەچێنرێت، وەک ئالیکی پەلەوەر و ئاژەڵ بەکار دەهێنرێت ودەچێتە هەندێ پیشەسازییەوە، بەتایبەتی پیشەسازی رۆن.

## راهێنان:

١.گەنمە شامی دووجۆری هەیە...........و.............

٢.برنج (چەڵتوک)پێویستی بە........زۆر هەیە.

٣.ناوچەکانی مەرەزەکردن(چاندنی برنج) لە هەرێمی کوردستان زۆرن وەک (........و........).

٤.ئالیکی ئاژەڵ و پەلەوەر بە زۆری لە............و.......... دروستدەکرێت.



برنج



گەنمە شامی

**٢. سەوزە و میوە:-**

**أ.سەوزە** / لە گرنگی دا لەدوای دانەوێلە دێت، بە خۆراکی سەرەکی مرۆڤ دادەنرێت، کە ڕۆژانە لەسەر خوانی نانخواردن دادەنرێت.

سەوزە دووجۆری هەیە:-



**١.سەوزەی هاوینە** / ئەو بەروبوومانە دەگرێتەوە کە لە وەرزی هاویندا پێدەگەن، وەک(تەماتە، بامیە، خەیار (ئاروو)، شوتی، کاڵەک..تد.

بەڵام لەکاتی ئێستادا بەهۆی پێشکەوتنی زانستی هەندێک بەروبووم لە هەموو وەرزەکانی ساڵ لە خانووی پلاستیکیدا بەرهەم دەهێنرێت وەک تەماتە، خەیار، بیبەر، باینجان ...هتد.



**٢.سەوزەی زستانە** / ئەم جۆرە بەروبوومانە لەوەرزی زستاندا پێدەگەن، وەک (شێلم چەوەندەر، کەلەرم، قەرنابیت، و توور وسلق و.......تد.

**ب.میـــوە** / کوردستان هەر لەکۆنەوە بەمیوە بەناوبانگ بووە، لە میوە بەناوبانگەکانی ئەم ناوچەیە (ترێ، سێو، هەنجیر، هەنار، هەرمێ، هەڵوژە، گوێز و باوی......تد.) میوەی کوردستان بە زۆری لە وەرزی هاوین پێدەگات.

مزرەمەنیش لەکوردستان دەچینرێت بەتایبەتی لەپێدەشتەکانی گەرمەسێر لە شارەکانی (خانەقین و مندلی)وەک (پرتەقاڵ، لیمۆ، نارنج وترنج.......تد.



**چالاکی:-**

لە وەرزی زستاندا بەروبوومی هاوینە لە بازارەکان دەست دەکەوێت.

**مامۆستای بەرێز:** هۆی ئەم گۆڕانە و سوودی خانووی پلاستیکی لەکشتوکاڵ کردن بۆ قوتابییەکان ڕوونبکەرەوە.

### ٣.ئەو بەروبوومانەی کە دەچنە پیشەسازییەوە.

هەندێک بەروبوومی کشتوکاڵی هەیە مرۆڤ ناتوانێ یەکسەر سوودیان لێوەربگرێت.بەڵکو پاش ئەوەی دەچێتە پیشەسازییەوە، ئینجا سوودبەخش دەبێت.وەکو ئەم بەروبوومانەی خوارەوە:ـ

زانیاری:ـ

لەم سەردەمەی ئێستادا بەهۆی پێشکەوتنی پیشەسازی زۆربەی هەرەزۆری بەروبوومە کشتوکاڵییەکان بەدانەویڵەشەوە دەچێتە بواری پیشەسازی خۆراک و لە قووتووبەندکردن.



زانیاری:ـ

لەساڵەکانی(٢٠٠٠)ی زاینی بەدواوە کشتوکاڵی توتن لە هەرێم رۆڵی ئابووری گرنگی نەماوە، چونکە کارگەکانی دروستکردنی جگەرە گروتینی بەرهەمهێنانیان کەمبۆتەوە، لەبەر ئەوەی ناتوانێت بەربەرەکانی بازاڕی جیهانی جگەرە بکات. بازرگانی ناردنە دەرەوەش ئاسانکاری پێویستی بۆناکرێت.

**ا.لۆکە:ـ**

بەروبوومێکی هاوینەیە، گرنگی هەمەجۆری هەیە، لە پیشەسازی رستن و چنیندا بەکاردەهێندرێت، دەنکەکەشی دەگوشرێت رۆنی لێدەردەهێنرێت، قەد و گەڵاکەشی بۆ ئالیکی ئاژەڵ بەکاردەهێنرێت. پارێزگای کەرکوک بە بەرهەمهێنانی لۆکە بەناوبانگە.

زانیاری:ـ

باشترین جۆری لۆکە: لۆکەی سپی و تیلەی درێژە، لە ناوچە گەرمەکان دەچێنرێت.

### ب. گوڵەبەڕۆژە:-



بەرهەمێکی هاوینەیە، بە زۆری لە دەشتەکانی بیتوێن و پشدەر و ناوچە جیاجیاکانی تری هەرێمی کوردستان دەچێنرێت. گرنگی گوڵە بەڕۆژە لە پیشەسازی ڕۆنی رووەکدا بەکاردەهێنرێت و پاشماوەکەشی بۆ ئالیکی ئاژەڵ سوودی لێوەردەگیرێت.

**زانیاری:-**



گوڵەبەڕۆژە: زۆربەی بەرهەمەکەی بۆ دەرەوەی هەرێم دەنێردرێت، چونکە کارگەی دروستکردنی ڕۆن لەهەرێمی کوردستان نییە، بەشێکی لە ناوخۆ بەکار دەبردرێت.

### ج. کونجی:-

ئەمەش بەروبوومێکی هاوینەیە، بۆ زۆر مەبەست بەکاردێت (بۆ خواردن و دروستکردنی شیرینی و دەرهێنانی ڕۆن....تد).

### ٤. بەروبوومەکانی ئالیک:-

وێنجە و سێپەرە ئالیکی سەوزن ئاژەڵ، بە وشک کراوەیش دەدرێتە ئاژەڵ، لە ناوچە بەراوەکان دەچێنرێت، بەتایبەتی لە دەوروبەری شارەکان.بێجگە لەمانە (جۆ)ش وەک ئالیک بۆ ئاژەڵ بەکاردەهێنرێت.



ئالیکی سروشتی

## ٢ - سامانی ئاژەڵ

### ئەو ئاژەڵانەی لە هەرێمی کوردستان بەخێودەکرێن:



**١. مەڕ** /لە ئاژەڵە گرنگەکانی هەرێمی کوردستانە، مەڕی کوردی بەڕەنگی سپی وخوری درێژ و زبر ناسراوە، سوود لە شیرەکەی وەردەگیرێت و دەکرێتە چەندین جۆر بەرهەم وەک (ماست، پەنیر..تد)سوود لەگۆشت و خوریەکەی وەردەگیرێت.

دەشتەکانی هەولێر و حەمرین وناوچەکانی سلێمانی و دهۆک بۆ بەخێوکردنی مەڕ بەناوبانگن.

**٢.بزن:.**

ئاژەڵێکە دەتوانێت لە دەشت وشاخ ولەوەڕگای کەم گیا بژیت.چونکە توانای جوولەی خێرای هەیە و خۆراکی خۆی پەیدادەکات، بەرگەی نەخۆشی دەگرێت، سوود لە شیر و گۆشت و مووەکەی وەردەگیرێت.

**٣.مانگا (ڕەشەوڵاخ):.**

مانگا لەو ئاژەڵانەیە سوود لە شیر وگۆشت و پیستەکەی وەردەگیرێت. هەرێمی کوردستان شوێنێکی لەباری هەیە بۆ بەخێوکردنی مانگا، بەتایبەتی لە دەشت و دۆڵی ناوچە شاخاوییەکان، چونکە گژوگیای درێژ و پڕی زۆرە.





## راهێنان:

پ١:ئەم بۆشاییانە پڕبکەرەوە:

١.جۆ سوودی زۆری هەیە بۆ.............و.............بەکاردێت.

٢.گەنمەشامی لە ڕووی کاتی چاندنییەوە بەروبوومێکی...........

٣.پارێزگای.........بە پلەی یەکەم دێت لە چاندنی توتن.

٤.ئاژەڵی...........دەتوانێت لە دەشت و شاخدا بژیت.

٥.مەڕ ئاژەڵێکی سوودمەندە، سوود لە.......و............ وەردەگرێت.

٦.کونجی لە پیشەسازی دەرهێنانی...........و............بەشداری دەکات.

**پ٢:نیشانەی ( √ )بۆ ڕاستەکان و نیشانەی (x) بۆ چەوتەکان دابنێ.**

.

١.کشتوکاڵ یەکەم جار لە کوردستان پەیدابووە.

٢.گوڵە بەڕۆژە لە زۆربەی ناوچەکانی هەرێم دەچێنرێت.

٣.توتن بۆ دروستکردنی جگەرە بەکار دێت.

٤.لۆکە لە پیشەسازی ڕستن وچنیندا بەشداری دەکات.

٥.گژوگیای (وێنجە و سێپەڕە)بە ووشک کراوەیش دەدرێنە ئاژەڵ.

٦.مانگا لە بلاوترین ئاژەڵەکانی هەرێمی کوردستانە.

٧. برنج بەروبوومێکی زستانەیە.



## دووەم - دەرامەتی کانزا و پیشەسازی لەهەرێمی کوردستان

١. سامانی کانزا: هەرێمی کوردستان لە رووی بوونی دەرامەتی کانزاوە دەوڵەمەندە وگەلێک جۆرە کانزای تێدایە. هەندێکیان سوودیان لێوەرگیراوە و ئێستا بەکاردەهێنرێن، هەندێکی تر سوودیان لێوەرنەگیراوە، چونکە تاوەکو ئێستا دەرنەهێنراون.

**گرنگترین سامانە کانزاییەکانی هەرێمی کوردستان ئەمانەن:**

**أ.نەوت** /هەر لە زووەوە لە هەرێمی کوردستان دۆزراوەتەوە و ناسیویانە، لە ساڵی (١٩٢٧ز) لە باباگوڕگوڕی شاری کەرکوک دەست بەدەرهێنانی کراوە بۆ مەبەستی بازرگانی(ناردنە دەرەوە).

**کێڵگە نەوتییەکانی هەرێم بریتین لە:**

١.کێڵگەکانی (بابەگوڕگوڕ، بای حەسەن، چەمەبۆر)لە پارێزگای کەرکوک.

٢.کێڵگەکانی (عێن زالە، بەتمە)لە پارێزگای نەینەوا.

٣.کێڵگەی نەوتی (نەوت خانە) لە خانەقین.

٤.کێڵگەکانی نەوتی (شیواشۆک) لە تەقتەق، لە پارێزگای هەولێر.

٥.کێڵگەی نەوتی (تاوکێ)لە زاخۆ، لە پارێزگای دهۆک.




نەخشەی نەوت وسامانە سروشتییەکان

زانیاری:.


وێنەی وێستگەی کارەبای پیرداوە(هەولێر)

لە سەردەمی حکومەتی هەرێم پشکنین وگەڕان بەردەوامە بۆ دۆزینەوە و دەرهێنانی نەوت، لە هەرێم توانراوە نەوت لە کێڵگەکانی (شیواشۆک لە تەقتەق) و (تاوکی لە زاخۆ) دەربهێنرێت. لە١-٦-٩‎٢٠٠ دەستکرا بە ناردنە دەرەوەی نەوت لە رێگای بۆری هەناردەی نەوتی عێراق. بێجگە لە دروستکردنی چەندین پاڵاوگەی نەوت لە (بازیان، خەبات) کە ئێستا دەتوانێت بەشێک لە پێویستی سوتەمەنی هەرێم دابین بکات.

**ب.گازی سروشتی:**

لەناوچە نەوتییەکان هەیە و لەگەل نەوت دەردەهێنرێت.ئەمە جگە کە لە هەندێ چاڵگەی تایبەت بەگازی سروشتی لە هەرێمی کوردستاندا هەیە.

**زانیاری:.**

١- پرۆژەی ناردنە دەرەوەی گازی سروشتی کوردستان لە ئارادایە بۆ ولاتانی ئەوروپا بە رێگای تورکیا، کە پێگەی ئابووری و سیاسی هەرێمی کوردستان بەرز دەکاتەوە.

٢- بۆ دابینکردنی خزمەتگوزاری بۆ هاولاتیان حکومەتی هەرێم بە هاوکاری کەرتی تایبەت چەندین پرۆژەی گرنگی بۆ وەبەرهێنانی کارەبا دامەزراندوە، کە بە هۆی گازی سروشتی و گازوایل کاردەکەن. گازە سروشتییەکە بە هۆی لوولەوە دەگوازرێتەوە بۆ وێستگەکانی کارەبای (١٠٠٠میگاوات)هەولێرو (١٠٠٠میگاوات) سلێمانی. هەر لەگەڵ ئەمانەش وێستگەی کارەبای دهۆکی گازوایلی (٥٠٠میگاواتی ) و وێستگەی باعەدرێی (١٧٠ مێگاواتی ) دامەزراندوە.

## راهێنان:

**:نیشانەی ( √ )بۆ راستەکان و نیشانەی (X) بۆ چەوتەکان دابنێ.**

١.لە هەرێمی کوردستان دەرامەتی کانزا زۆرە.

٢.نەوت کانزایێکی گرنگە.

٣.وێستگەی کارەبای (١٠٠٠میگاواتی) هەولێر گازی سروشتی لە چاڵگە گازییەکانی چەمچەماڵەوە بۆ دێت.

٤.وەبەرهێنانی لە کێڵگە نەوتییەکانی(تاوکی)لە زاخۆ لە دەستکەوتەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستانە.

٥.کێڵگە نەوتییەکانی بابەگوڕگوڕ دەکەوێتە پارێزگای نەینەوا.

٦.وێستگەی کارەبای (١٠٠٠میگاواتی) سلێمانی دەکەوێتە چەمچەماڵ.

## ٢ - پیشەسازی لە هەرێمی کوردستان

پیشەسازی: بریتیە لە کرداری گۆڕینی کەرەستەی (خاو) بۆ کەل وپەلی دروستکراو.

دانیشتوانی هەرێمی کوردستان هەر لە کۆنەوە خەریکی پیشەی دەستی جۆراوجۆر بوونە بۆ پەیداکردنی پێداویستەکانی ژیانی رۆژانەیان، وەک پیشەی تەونکردن (بۆ دروستکردنی مافور و رایەخ وبەڕە و...تد)، پیشەی دروستکردنی پێڵاو و جلو بەرگ وگۆزەو گلکاری وگەلێ شتی تر.



پاڵاوتگەی خورمەڵە لە هەولێر

بەڵام ئەمڕۆ ئەو پێشکەوتنە پیشەسازییە مەزنەی کە لە جیهاندا هەیە، هەرێمی کوردستان تاڕادەیەک لێی بێبەشە. جگە لە هەندێ کارگەی بچوک نەبێت کە لە شارەکانی کوردستاندا هەیە، هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ هەڵسوکەوتی رژێمە کۆنەکانی عێراق کە ناوچەکەیان پشتگوێ خستبوو لە رووی گەشەپێدانی پیشەسازییەوە.

### چالاکـــی:ـ

(چۆن دەتوانین لە هەرێمی کوردستان پەرە بە پیشەسازی بدەین؟)

مامۆستای بەڕێز:ـ هاوکاری قوتابییەکان بکە بۆ دەست نیشانکردنی هۆیەکانی پەرەپێدانی پیشەسازی لە هەرێمی کوردستان.

### راهێنان:

١.بۆچی کوردستان بەدواکەوتوو دادەنرێت لە رووی پیشەسازییەوە ؟.

٢.چ جۆرە پیشەیەکی دەستی لە کوردستان زۆر باوبووە ؟.

### زانیاری:ـ

**گرنگترین دامەزراوە پیشەسازییەکانی هەرێمی کوردستان بریتین لە:**

١.کارگەی چیمەنتۆی تاسلوجە و بازیان لە سلێمانی و لەیلان لە کەرکوک.



پیشەی کاری دەستی

٢.پیشەسازی پاڵاوتنی نەوت لە کەرکوک.

٣.کارگەی جل و بەرگی ئامادەکراو لە سلێمانی و دهۆک.

٤.کارگەی ئامادەکرنی خواردنەوە گازییەکان لە هەولێر.

٥.کارگەی رستن وچنین لە کەرکوک و کفری.

٦.کارگەی بەردی مەرمەڕ لە هەولێر و سلێمانی.

٧.کارگەی گەچ وخشتی سورکراوە لە هەولێر و سلێمانی.

٨.کارگەی شیش لە هەولێر.

٩.کارگەی ئاوی کانزایی لە هەولێر، سلێمانی، زاخۆ و ئاکرێ.

## بەشی هەوتەم
# گەشت و گوزار

ئاووهەوا و سروشتی هەرێمی کوردستان لە دیمەنی سەرنج راکیشی شاخ و دۆڵ وکانی وسەرچاوە و تاڤگەو مەڵبەندە ئاینی و شوێنە دێرینەکان هۆکاری سەرەکین بۆ ئەوەی هەرێم ببێتە ناوچەیەکی گەشتیاری گرنگ بۆ دانیشتوانی ناوچەکە بەتایبەتی و دانیشتوانی ناوچەکانی تری عێراقیش بەگشتی، کە ساڵانە گەشتیاران لە هەموو لایەکی وڵات رووی تێدەکەن. بۆ کات بردنە سەر و پشوودان. چەندین هاوینەهەوار و شوێنی تایبەت لە کوردستان هەیە .



نەخشەی گەشتیاری لەهەرێمی کوردستان


وێنەی گەلی عەلی بەگ

**ناوچەکانی گەشتو گوزار لە هەرێم بەم شێوەیە دابەشدەکرێت:**

**یەکەم / هاوینە هەوارەکان و زستانەگەشت بۆ ناوچەی بەفریارین:**

**١.هاوینە هەوارەکانی پارێزگای هەولێر:**(شەقڵاوە، گەلی عەلی بەگ، بێخاڵ، جوندیان......تد).

**٢.هاوینە هەوارەکانی پارێزگای سلێمانی:** (سەرچنار، دوکان، دەربەندیخان، ئەحمەداوە، تەوێلە، بیارە، قەرەداغ وئەزمر...تد).

**٣.هاوینەهەوارەکانی پارێزگای دهۆک:** (سەرسەنگ، سوارەتوکە، زاوێتە، سۆلاڤ، ئاشاوە وئانیشکێ......تد).


سەرچنار


ئەحمەد ئاوا (سلێمانی)


هاوینە هەواری سۆلاڤ

## دووەم / شوێنە دێرینەکان:

قەڵاو منارەی هەولێر، (ئەشکەوتی شانەدەر و ئەشکەوتی هەزارمێرد، کە پاشماوەی مرۆڤی نیاندارتالیان لێدۆزراوەتەوە)، قەڵای شێروانە لە کەلار و هەڵکەندراوەکانی خنس لە شێخان وگوندی چەرمۆ لە چەمچەماڵ و شوێنەوارەکانی بەکراوە لە هەڵەبجە و دەیان شوێنەواری تر هەرێمی کوردستانیان کردۆتە ناوچەیەکی گەشتیاری.


قەڵای ئامێدی


قەڵای شێروانە

## سێیەم /مەڵبەندە ئاینییەکان:

لە کوردستان گەلێ مەزاری پیاوچاکان و پەرستگاو شوێنی ئاینی جیاجیا هەیە، هاووڵاتیان سەردانیان دەکەن، وەکو مزگەوتی گەورەی سلێمانی (کاکە ئەحمەدی شێخ)، پەرستگای (لالش) و(شێخ ئادی)کەشوێنی پیرۆزی ئێزیدییەکانن

(دێرمارمەتی)لە چیای مەقلوب، (دێر رەبەن بۆیە)لە شەقلاوە، (مەزار مەریەمانە لەعەنکاوە و (دانیال پێغەمبەر) لە کەرکوک و (پیری شالیار) لە هەورامان و چەندان مەڵبەندی تر.












### راهێنان:

:نیشانەی ( √ )بۆ راستەکان و نیشانەی (x) بۆ چەوتەکان دابنێ.

١.تەنها ئاو و هەوا و سروشتی کوردستان هۆکاری سەرەکین بۆ پەیداکردنی گەشتیاری لە کوردستان.

٢.شەقلاوە شوێنێکی گەشتیاری گرنگە لە رووی هاوینە هەوارو مەڵبەندە ئاینییەکان.

٣.لالش پەرستگای پیرۆزی ئێزیدییەکانە.

٤.پێکهاتەی سروشت و شوێنەواری دێرین و مەڵبەندە ئاینییەکان لە هەرێمی کوردستان هۆی دروستبوونی گەشت و گوزارە.

## مێژووی کۆن و ناوەند

**مێژوو:** تۆماری بەسەرهاتی مرۆڤایەتییە لە سەردەمی کۆن، باس لە ڕووداوەکانی ڕابردوو دەکات.

## قۆناغەکانی

مێژووی کۆن و ناوەند
مێژووی نوێ و هاوچەرخ

## بەشی یەکەم:
# مێژووی کوردستانی دێرین

### ١.کوردستانی دێرین:

عێراق و بەشی زۆری کوردستان لە کۆندا میزۆپۆتامیا (وڵاتی دوو رووبار) (وادی الرافدین) ناودەبرا چونکە هەردوو زێی دیجلەو فورات پێیاندا تێدەپەڕین و زەوییەکانی ئاوەدان و بوون بە سەرچاوەی ژیان و نیشتەجێبوونی مرۆڤ و بنیادنانی کۆنترین شارستانییەت لە مێژووی مرۆڤایەتیدا.







باکوور و خۆرهەڵاتی دۆڵی میزۆپۆتامیا (کوردستان) بە لانکەی شارستانی دەژمێردرێت، چونکە مرۆڤی سەرەتایی لە ئەشکەوتەکان و لاپاڵی زنجیرە چیاکانی زاگرۆس ژیاوە، بۆ ژیانی رۆژانەشی پشتی بە سروشت بەستووە، دانەوێڵە و بەری درەختی کۆکردۆتەوە و بۆخواردن بەکاری هێناوە، ڕاوی ئاژەڵی کێوی و پەلەوەری کردووە، گۆشتەکەی خواردووە و پێستەکەشی لەبەرکردووە. بۆ خۆ پارستن لە سەرمای زستان و گەرما و درندەی کێوی پەنای بۆ ئەشکەوتەکان بردووە، بەرەبەرە گۆڕانکاری بەسەر ژیانی داهاتووە، ئاگری کردۆتەوە و بۆ سوود وەرگرتن بەکاری هێناوە.



(نەخشەی میزۆپۆتامیا)


دیمەنی مرۆڤی کۆن

هەر ئەم مرۆڤانە بەرەبەرە دابەزیون بەرەو گردۆلکە و دەشتەکان و کەناری رووبارەکان.

ئامێر و کەلوپەل و کەرەستەی جۆراوجۆریان لە بەرد دروستکردووە راو وکاری رۆژانەیان پێ ئەنجامداوە، پاشان ئاژەڵی کێوییان ماڵی کردووە، بەتایبەتی سەگ کە بۆ پاسەوانی بەکاریان هێناوە، ئینجا فێری کشتوکاڵ بوونە دانەوێڵەیان بەرهەمهێناوە و گوند و شار و پەرستگایان بنیاد ناوە و پەرەیان بەشارستانێتی داوە.نموونەی زۆریشمان لەو باروە هەیە لە کوردستان، گرنگترینیان گوندی چەرمۆیە کە دەکەوێتە نزیک شاری چەمچەماڵ کە مرۆڤ کشتوکاڵی

کردووە و نیشتەجێبووە و ئاژەڵی ماڵی کردووە. نموونەیەکی تریش کە لەساڵی (١٩٨٥)لەلایەن تیمێکی پۆلەندی لە باشووری شاری دهۆک گوندی (نەمرکێ)یان دۆزییەوە، مێژووەکەی بۆ ساڵانی (٨٥٠٠)پێش زایین دەگەڕێتەوە. لەنزیک شاری ئامەدیش (دیاربەکر)گوندی (گۆیەلکی تەپە)دۆزرایەوە کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ (٩٨٠٠-٨٥٠٠ پێش زایین). هەروەها ئەشکەوتی خانزاد لە هەریر کە بە پەناگەی مرۆڤی کۆن ناسراوە پێش زیاتر لە ١٠ هەزار ساڵ.



ئەشکەوتی خانزاد(حەریر)پەناگەی مرۆڤی کۆن بووە

## راهێنان:

مرۆڤی سەرەتایی راوی ئاژەڵی کێوی دەکرد بۆ ئەوەی ئەم سوودانەی لێوەربگرێت:

١.

٢.

٣.

## چالاکی

دۆزینەوەی ئاگر وەرچەرخانێکی گرنگ بوو لە مێژوو، چونکە ئاگر سوودی زۆری هەبوو، کە ئەمانەن:

١.

٢.

٣.

## ٢-چەند شوێنەوارێکی دێرینی کوردستان:

ئەگەر بێتو گەشتێک بە نێو کوردستاندا بکەین دەبینین پڕیەتی لە شوێنەوار و پاشماوەی دێرینی وەک ئەشکەوت و گرد و قەڵا و شووره و پرد و وێنەی هەڵکەندرا و لە سەر بەرد و شاخ و....تد، ئەمانە گشتی شارستانییەتی باوک وباپیرانمان پێشاندەدەن، کە لە نێو ئەم شوینەوارانەشدا ئێسک و پروسکی مرۆڤ و ئاژەڵ و پاشماوەی گەنم وجۆو کەرەستەو ئامێری جۆراوجۆری راوکردن وکشتوکاڵ و کارەکانی رۆژانەی ناومالّ دۆزراونەتەوە، کە ئەمەش رێنیشاندەرە بۆ شێوەو چۆنییەتی ژیانی رۆژانە و دەست رەنگینی و لێهاتوویی و وەستایی باوک و باپیرانمان.



دێرینەکانی چیای نەمرود

### هەندێ لە شوێنەوارە دێرینەکانی کوردستان:

#### أ.ئەشکەوتی شانەدەر:-

ئەم ئەشکەوتە دەکەوێتە باکووری هەولێر لە قەزای مێرگە سوور، لە بەشی خوارووی چیای برادۆست لەسەر زێی گەورە.لەم ئەشکەوتە ئێسک و پروسکی جۆری مرۆڤی نیاندرتالی لێ دۆزراوەتەوە، کەلەنێویاندا ئێسکی منداڵی ساوای تێدابووە، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ (٧٥٠٠٠-٤٥٠٠٠ ساڵ پێش زایین)کە مرۆڤی تێدا ناشتراوە.لەگەڵ چەندەها کەرەستەو ئامێری کشتوکاڵی.

مرۆڤی نیاندرتال کۆنترین جۆری مرۆڤە، بۆیە ئەم ناوەی لێنراوە، چونکە بۆ یەکەم جار پاشماوەی ئێسک و پروسکی ئەم مرۆڤە لە دۆڵی نیاندرتال لە ئەڵمانیا دۆزرایەوە.



ئەشکەوتی شانەدەر



ئەشکەوتی هەزارمێرد

## ب. ئەشکەوتی هەزارمێرد:-

ئەم ئەشکەوتە دەکەوێتە دووری (١٣)کم لە باشووری خۆرئاوای شاری سلێمانی، لە دامێنی چیای بەرانان، کە جگە لەم ئەشکەوتە حەوت ئەشکەوتی تر هەن، ئەشکەوتێکی تریش لەم ئەشکەوتەدا چەندەها کەرەستە و ئامێری بەردی بەنرخی ئێسک و پروسکی مرۆڤی نیاندرتالی لێدۆزراوەتەوە.



## ج.نوزی:-

یەکێکە لەو شوێنەوارە دێرینانەی کوردستان کە دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای شاری کەرکوک و ئێستا بە (یۆرغان تەپە)ناسراوە، پاشماوەی چەندین سەردەمە جیاوازەکانی مێژووی کۆنی لێدۆزراوەتەوە، بەتایبەتی هۆریەکان (خووریەکان) گەلێکی کۆنی کوردستانی دێرین بوون لە پاشاندا دەوڵەتێکیان دامەزراندن بەناوی دەوڵەتی میتانی.



وێنەی چەند گڵ و پەلێک لە شوێنەواری نوزی

## بەشی دووەم
# نەتەوە دێرینەکانی کوردستان

لە کوردستانی دێرین کە زنجیرە چیاکانی زاگرۆس و ڕۆژهەڵات و باکووری میزۆپۆتامیا دەگرێتەوە، چەندین گەل و نەتەوە ژیاون، بە باوک و باپیرانی کورد دادەنرێن.

لەو گەل و نەتەوانەش:ـ (سوبارییەکان، لۆلۆییەکان، گۆتییەکان، کاشییەکان، مادەکان وکاردۆخییەکان.......).وا لە خوارەوە بەکورتی ئاماژە بەهەندێکیان دەکەین:ـ



وێنەی هەڵکەندراوێکی سەردەمی لۆلۆییەکان

١.لۆلۆییەکان:ـ یەکێکن لە نەتەوە هەرەدێرینەکانی کوردستان لە ناوچەکانی ئەمڕۆی پارێزگای سلێمانی نیشتەجێبوون.ناوچەکەیان چەندەها جار تووشی چاوتێبڕینی ئەکەدییەکان بووە تا ئەوەبوو بەسەرۆکایەتی (نەرام سین)توانیان سەرکەون بەسەر لۆلۆییەکان.

ئەم سەرکەوتنەشی لەسەر میلێکی بەردینی دوو مەتر بەرز تۆمارکرد لە دەربەندی گاور لەچیای قەرەداغ. ئەم میلە کە بە(میلی سەرکەوتن) ناسراوە، ئێستا لەمۆزەخانەی لۆڤەر لە پاریس لە وڵاتی فەرەنسا پارێزراوە.

بەڵام زۆری پێ نەچوو لۆلۆییەکان خۆیان یەکخستەوەو لەژێر سەرکردایەتی شا (ئانۆ بانینی)توانیان سەرکەون بەسەر ئەکەدییەکان.

لۆلۆییەکان وەستاو شارەزای کاری پەیکەر سازی و داتاشین و هونەری بیناسازی بوون.

٢.گۆتییەکان:ـ ئەمانەش لە نەتەوە دێرینەکانی تری کوردستان بوون، لەناوچەکانی نێوان زێی بچوک و زێی سیرواندا دەژیان، پایتەختەکەیان بەناوی (ئەربخا) بووە، کە شاری کەرکوکی ئێستایە.



(ئەربخا) شاری کەرکوک

ناوچەکانیشیان چەند جارێک تووشی پەلامارو چاو تێبڕینی ئەکەدییەکان بووە، بەڵام ئەمانە توانییان بەرپەچیان بدەنەوە، تەنانەت توانیان دەوڵەتی ئەکەدیش بڕووخێنن.بۆ ماوەی زیاتر لە سەدەیەکیش دەستیان گرتووە بەسەر وڵاتی سۆمەرو ئەکەد (باشووری میزۆپۆتامیا) لەم ماوەیەشدا (٢١) بیست ویەک پاشا فەرمانڕەواییان کردووە.

### ٣.کاشییەکان:ـ



وێنەی عەقەرقوف

ئەمانەش لە نەتەوە دێرینەکانی کوردستان بوون لە ناوچەکانی ئەمڕۆی کرماشان و لوڕستان لە رۆژهەڵاتی کوردستان دەژیان، پاشان بەرەو دەشتەکانی رۆژهەڵاتی دیجلە شۆڕبوونەوە.بۆماوەی زیاتر لە چوار سەدە دەستیان بە سەر وڵاتی بابل داگرت و دەوڵەتێکی مەزنیان دامەزراند لە مێژوودا بە (کاردۆنیاش) ناسراوە.

پایتەختێکی تازەیان دروستکرد ئێستا پاشماوەکەی لە (عەقەرقوف)لە باکووری رۆژئاوای شاری بەغدایە، لە گرنگترین شوێنەوارە جێماوەکانی زەقورەکەیەتی، ئەمەش وەستایی و شارەزایی و لێهاتووی ئەوانمان بۆ دەردەخات لە بواری هونەری بیناسازی و کاری داتاشین، چونکە دیوارەکانی بە وێنەی رەنگاو رەنگ نەخشێنرابوون.

### ٤. مادەکان (میدییەکان):ـ



وێنەیەکی شارستانییەتی میدییەکان

میدییەکان تاماوەیەکی درێژ هەر لەسەر شێوەی هۆز و تیرەی بچووک بچووک دەژیان، بەڵام لە دەوروبەری ساڵانی (٧٠٠پێش زایین)یەکێک لە سەرکردەکانیان کەناوی (دیاکۆ) بوو توانی یەکیان بخات و دەوڵەتێکی بەهێز دابمەزرێنێ و شاری ئەکبەتانا (هەمەدانی ئێستا )بکاتە پایتەختی دەوڵەتەکە.

مادەکان بۆ ماوەیەکی درێژ بەرووی هێرش و پەلامارەکانی ئاشوریەکان وەستاون کە

دەیانویست ناوچەکە داگیربکەن.ئەوەبوو مادەکان بەسەرکردایەتی کەی خسرەو(کیاکسار) بەهاو پەیمانێتی لەگەڵ کدانییەکانی بابل، هەر دوولا ساڵی (٦١٢پێش زایین) هێرشیان کردە سەر (نەینەوا) پایتەختی ئاشورییەکان و کۆتاییان بە دەوڵەتی ئاشوری هێنا.

سنوری دەوڵەتی میدیا لە سەردەمی کەی خسرەو هەموو کوردستانی گرتەوە، ئەمە جگە لە ناوچەکانی دەوروبەریشی.



وێنەی هەڵکەندراوی قزقاپان

## راهێنان:

١.ئەم بۆشاییانە بە وشەی گونجاو پڕبکەرەوە:....

أ.لەوگەل ونەتەوانەی کە لە کوردستانی دێرین دا ژیاون ......و.......و.......و......

ب.دەوڵەتی میتانی لەلایەن گەلی............دامەزرا.

ج.کاشییەکان دەوڵەتێکی مەزنیان دامەزراند کە لە مێژوودا بە..........ناسراوە

٢.کوردستانی دێرین کوێ دەگرێتەوە ؟

٣.لەگەڵ مامۆستاکەت لە بارەی گرنگی دەوڵەتی میدیا لە مێژووی گەلی کورد دا بدوێ.

٤.سێ دەوڵەتی کۆنی کوردستانی دێرین بژمێرە.

## بەشی سێیەم
# عێراق لە چاخە کۆنەکان



پەیکەری نەرام سین

### نەتەوە دێرینەکانی عێراق

#### ١.سۆمەرییەکان:ـ

یەکێکن لە نەتەوە هەرەدێرینەکان کە لە باشووری میزۆپۆتامیا نیشتەجێبوون، لەسەر هەردوو کەناری دیجلەو فورات گوند و شار و پەرستگایان دروستکرد، کشتوکاڵیان دەکرد، بازرگانیان لەگەڵ نەتەوەکانی دراوسێیاندا ئەنجامدەدا، چەندەها دەسکەوتی شارستانی گرنگیان بەدەست هێناوە لە کانزا و گڵێنەسازی و بیناسازی وەک زەقورە و دروستکردنی مۆر (الختم)، دۆزینەوەی کۆنترین جۆری نوسین لە دەوروبەری ساڵانی (٣٢٠٠ پ.ز)کە بەنوسینی مێخی (المسماری)ناسراوە، ئەم نووسینەش بۆ ئەنجامدانی کاروباری رۆژانە بەکار هاتووە.

#### ٢.ئەکەدییەکان:ـ

بەکۆنترین ئەو نەتەوە سامییانە دادەنرین کە لە نیمچە دوورگەی عەرەبییەوە کۆچیان کردوە بۆ باشووری میزۆپۆتامیا، پاشان دەوڵەتێکی بەهێزیان بەسەرکردایەتی (سەرجۆنی ئەکەدی)دامەزراند، دوای یەکخستنی (دەوڵەتانی شاری سۆمەر). لە سەردەمی پاشا(نەرام سین) ئەکەدییەکان لە هەموو لایەکەوە پەلیان هاویشت و ناوچەیەکی زۆر فراوانیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیان.



تابلۆیەکی قوری نوسینی بزماری لەسەر نەخشێندراوە



(وێنەی زەقورە)





مۆرێکی لوولی لە سەردەمی
سۆمەرییەکاندا

زانیاری:

**زەقورە چییە**؟ ئەکەدییەکان زەقورەیان بە مەبەستی پەرستگا دروستکردبوو واتا (شوێنی خواوەندەکان) ئیستاش پاشماوەی ئەم شوێنەوارە لە باشووری عێراق ماوە.

## راهێنان:

ئەم بۆشاییانە پڕبکەوە:

١.لەسەردەمی پاشای ئەکەدی.........هونەری پەیکەرتاشی پێشکەوت.

٢.نوسینی مێخی (بزماری) لەلایەن..........دۆزرایەوە.

٣.سۆمەرییەکان لە بەشی باشووری........... نیشتەجێبوون.



پەیکەرێکی سەردەمی ئاشوورییەکان

**٣.ئاشورییەکان:** ئەمانە یەکێکن لەو نەتەوانەی کە لە باکووری دۆڵی میزۆپۆتامیاو بەشێکی کوردستان نیشتەجێبوون، وامەزەندە دەکرێت کە ناوەکەیان لە ناوی یەکەم پایتەختیان شاری (ئاشور)و لە ناوی خواوەندەی گەورەیان (ئاشور) هاتبێت.

ئاشورییەکان دەوڵەتێکی مەزنیان پێکهێنا، چەندین پاشای بەناوبانگیان تێدا هەڵکەوت و سنوری دەوڵەتەکەیان زۆر فراوانکردوە، هەندێک لەم پاشایانە چەندین پرۆژەی خزمەتگوزاری ئاودێری و ئاوەدانکردنەوەیان ئەنجامدا کە تا ئێستاش پاشماوەیان ماوە، لەوانە پرۆژەی ئاوی سەنحاریب کە لە چەمی بەستۆرەوە (لەنزیک گوندی قەلەمورتک)ئاوی بەرێگای کارێزەوە دەگەیاندە ناو قەلاّی هەولێر، هەروەها پرۆژەکانی تری ناوچەی شێخان (بەتایبەتی لەخەنەس)و نەینەوا کە گشتیان بۆ سەردەمی شا (سەنحاریب)دەگەڕێتەوە.

هەروەها لە پاشا بەناوبانگەکانی تری ئاشورییەکان شا (ئاشوربانیباڵ).



وێنەی خەنەس لەشێخان

## راهێنان:

١.سەنحاریب چ پرۆژەیەکی بۆ هەولێر کردووە ؟
٢.ناوی نەتەوەی (ئاشور) لەچییەوە هاتووە ؟.

## شوێنەوارە دێرینەکانی عێراق

**١.ئوور:** ئەم شارە ئێستا پاشماوەکەی دەکەوێتە نزیک شاری ناسریە لە پارێزگای زیقار، یەکێک بووە لە کۆنترین و گرنگترین شاری سۆمەرییەکان.



وێنەی پەیکەری ئوور نەمۆ

لەم شارەدا کۆمەڵێک سامان و کەلوپەلی بەنرخ لە (گۆڕستانی پاشایان)دۆزراوەتەوە، لە زێڕ و پەرداخ و خەنجەری زێڕین و هەندێ (تار) (قیثارە)ی رازاوە بەزێڕ و شتی تر.

شوینەوارەکانی ئەم شارە بریتیە لە زەقورەکەی ئوور.لەلایەن (ئوور نەمۆ)دامەزرێنەری بنەماڵەی ئووری سێهەم دروستکراوە.

٢.بابل:. پاشماوەی ئەم شارە دەکەوێتە نزیک شاری (الحله)لە سەر رووباری فورات.لە دوو سەردەم دا زۆر ناوبانگی دەرکردووە، یەکەمیان لەسەردەمی شا(حامورابی)لە شایە هەرە بەناوبانگەکانی دەوڵەتی بابلی یەکەم بوو، بەیاسایەکانی ناوبانگی دەرکردوە، کە لەسەر میلێکی بەردین نووسراوە بۆ رێکخستنی ژیان و ماف وئەرکی هاووڵاتیان و سزادانی تاوانباران و سەرپێچی کاران داینـاوە.ئێستاش ئەم میلە لە مۆزەخانەی (لۆڤەر)لە پاریس پارێزراوە.دووەمین سەردەمیش سەردەمی پاشا (نەبو خەزنەسر)بووە کە باخچە هەڵواسراوەکانی دروستکردووە.



**٣. ئاشوور:** پاشماوەی ئەم شارە ئێستابە(قەلای‌شەرقات)دەناسرێت و دەکەوێتە باشووری شاری موسڵ بەدووری ١١٠کم. شاری ئاشوور یەکەم پایتەختی ئاشوورییەکان بووە، لە هەمان کاتیشدا مەڵبەندی خوداوەندی گەورەی ئاشوورییەکان بوو بە ناوی (ئاشوور). گرنگترین شوێنەواری شارەکەش بریتین لە قوڵلەی (برج) سەرەکی شارەکە(زەقورە)کەئاشوورییەکان بۆ خواوەندی ئاشوور تەرخانیان کردبوو.



وێنەی میلەکەی حامورابی

### راهێنان:

ئەم رستانەی خوارەوە راستبکەوە:

١.شاری ئوور لە سەردەمی پاشای ئەکەدی (نەرام سین) ناوبانگی دەرکردووە.

٢.پاشماوەی شاری ئاشوور ئێستا بە قەلای کەرکوک دەناسرێ.

٣.حامورابی باخچەی هەڵواسراوی دروستکردووە.

## بەشی چوارەم
## مێژووی ئیسلام
## ژیاننامەی پێغەمبەر (د.خ)

### ئاینی ئیسلام

ئاینی ئیسلام دواین ئاینی ئاسمانییە کە خودای گەورە بۆ مرۆڤ ناردویەتی، هەموو ئاینە ئاسمانییەکان وەک ئیسلام و مەسیحییەت و جولەکە سەرچاوەکەیان فەرمانەکانی خودای گەورەیە کە بۆ هەریەکەیان کەسێکی راسپاردووە تاپەیامی ئەم ئاینە بە خەڵک رابگەیەنێت، ئەم کەسەش پێی دەگوترێت (پێغەمبەر)کە هەڵبژاردەی خودایە.

ئیسلام ئەو ئاینەیە کە بۆ پێغەمبەر محەممەد(د.خ)هاتووە لەرێگەی قورئانی پیرۆزەوە، ئەو کەسەش کە باوەڕ بەم ئاینە بهێنێ پێی دەگوترێ (موسڵمان).

### بارودۆخی عەرەبەکان پێش هاتنی ئاینی ئیسلام

ئاینی ئیسلام لە نیمچە دوورگەی عەرەبیدا پەیدابوو، لە بارودۆخێکدا کە لە زۆر لایەنەوە ناهەموار بوو، عەرەبەکانی ئەم ناوچەیە بەدەست چەندان کیشەو گرفتی ناخۆشەوە دەیان ناڵاند.

عەرەبەکان لە چەندان هۆز و بنەماڵە پێکهاتبوون، هەر دەستە بەرژەوەندی خۆی دەویست و لەگەڵ ئەوانیتردا ناکۆک بوون، زۆر جار لەسەر شتی بێ بایەخ شەڕ و ئاژاوەیان دەنایەوە خەڵکێکی زۆر لەناو دەچوون. ژیانی عەرەبەکانی دوورگەی عەرەبی سەخت بووە، چونکە وشک و بێ دەرامەت بووە. جگە لە هەندێ دابو نەریتی کۆمەڵایەتی ناشیرین وبت پەرستی و کۆیلایەتی.

### مەککە شوێنی لەدایک بوونی پێغەمبەر (د.خ)

### گرنگی شاری مەککە:-



وێنەی کەعبەی پیرۆز

پێغەمبەر محەممەد(د.خ)لە شاری مەککە لە دایک بووە، لە بنەماڵەی (هاشمی)سەر بە هۆزی قورەیش بوو، ئەم هۆزەش لە بەناوبانگترین هۆزەکانی مەککە بوو، باوکی ناوی (عەبدوڵای کوڕی عەبدولموتەلیب)ە، دایکیشی (ئامینەی کچی وەهەب)ە.پێغەمبەر بەر لەوەی لە دایک ببێت باوکی کۆچی دوای کردبوو،

لە ١٢ی مانگی ڕەبیعی یەکەم، بەرامبەر بە ٢٠ی مانگی نیسانی ساڵی ٥٧١زایینی) لە دایک بووە، ئەم ساڵەش لەلای عەرەبەکان بە ساڵی فیل ناسراوە و لە تەمەنی (٢٥)ساڵی ژنێکی ناوداری شاری مەککە کە ناوی (خەدیجە کچی خوەیلد)بوو شووی پێکردووە لە ئەشکەوتی(حەڕا)لە تەمەنی (٤٠)ساڵی خودا سروشی (وحی) بۆنارد.

مەککە شارێکی گرنگ و بەناوبانگ بوو، کاروانی بازرگانی پێدا تێدەپەڕی، هەر لە کۆنەوە شارێکی پیرۆز بووە بەتایبەت کە (کەعبە)ی پیرۆزی لێیە، کە لەلایەن ئیبراهیم پێغەمبەر (د.خ)دروستکراوە.

زانیاری:

**ساڵی فیل:** ئەو ساڵە بوو کەپادشای وڵاتی حەبەشە(ئەبرەهە)هێرشی کردە سەر مەککە بەمەبەستی تێکدانی کەعبە لەم هێرشەدا فیلی بەکار هێناوە.

### بانگەوازی خەڵک بۆ ئاینی ئیسلام:

پێغەمبەر لەسەرەتادا بەنهێنی دەستی بە بانگەواز کرد بۆ ئاینی ئیسلام، تەنیا چەند کەسێکی نزیک بڕوایان بەپێغەمبەر (د.خ)هێنا، پاشان کە ئەم ئاینە نوێیە لایەنگری زۆر بوو پێغەمبەر (د.خ)و هاوەڵەکانی بەئاشکرا بانگەوازی خەڵکیان دەکرد بۆ ئاینی نوێ.

### ڕاهێنان:

١. پێغەمبەر (د.خ)داوای لە خەڵک دەکرد کێ بپەرستن ؟.

٢. پێغەمبەر (د.خ) لە سەرەتادا چۆن دەستی بەبانگەواز کرد ؟.

٣. کێ لەم کەسانە زووتر باوەڕیان بەپێغەمبەر (د.خ)هێنا ؟ (خەدیجەی خێزانی، ئەبوبەکری صدیقی هاوڕێی، عەلی کوڕی ئەبو تالیبی ئامۆزای).

### هەڵوێستی خەڵکی مەککە بەرامبەر پێغەمبەر: ـ

خەڵکی مەککە هەر لە سەرەتاوە دژایەتی پێغەمبەریان کردو رازی نەبوون واز لە بت پەرستی بهێنن وپشت لە داب ونەریتە کۆنەکانیان بکەن، بەڵام پێغەمبەر (د.خ)و هاوەڵەکانی بەردەوام بوون لە سەر بانگەوازی خەڵک بۆ ئاینەکەی خۆیان و لە هەڕەشەی بێباوەڕەکان نەدەترسا.

### کۆچکردن بۆ مەدینە: ـ



وێنەی شاری مەدینە

لەگەڵ ئەوەشدا توندوتیژی بێباوەڕەکان موسوڵمانەکانی زۆر ئازار دەدا و رێگەیان لێدەگرتن تا نەتوانن پەیرەوی ئاینی خۆیان و بانگەوازی بۆ بکەن، بۆیە دەبوایە پێغەمبەر (د.خ)رێگە چارەیەک بدۆزێتەوە، ئەوە بوو بریاری دا خۆی و هاوەڵەکانی مەککە جێبهێڵن و کۆچ بکەن بۆ شارێکی دی، کەئەویش شاری (یەثرب)بوو، کەهەندێک لەخەلکی ئەم شارە لەکاتی حەج دا ببوونە موسوڵمان و داوایان لە پێغەمبەر کرد بچێتە شارەکەیان کە گەیشتە ئەوێ ناوی شارەکەی گۆڕی بۆ (مەدینەی منوەرە).



مزگەوتی پێغەمبەر لەمەدینە

### راهێنان:

ئەم رستانە راستن یا چەوتن ؟، چەوتەکانیش راست بکەرەوە.

١.خەڵکی مەککە هەموویان بە ئاینی ئیسلام رازی بوون.
٢.خەلکی مەککە بت پەرست بوون.
٣.پێغەمبەر (د.خ) و هاوەڵەکانی لە هەڕەشە دەترسان.
٤.پێغەمبەر (د.خ) بۆشاری مەدینە کۆچی کرد.

## کارەکانـی پێغەمبەر(د.خ) لە مەدینە:

پێغەمبەر (د.خ) لە مەدینە چەند کارێکی گرنگی ئەنجامدا، بەر لە هەموو شتێک مزگەوتێکی دروستکرد بۆ نوێژکردنوو بەڕێوەبردنی کاروباری موسوڵمانان، ئەم مزگەوتەش تائێستا ماوە، هەروەها (بروانامەی مەدینە)ی دەرکرد بۆ ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان خەڵکی شاری (مەدینە)و دیاریکردنی ئەرک ومافی دانیشتوانەکەی کە لە دوو بەش پێکهاتبوون:

١.کوچکردووەکان کە لەگەڵ پێغەمبەر (د.خ) لە مەککەوە کۆچیان کردبوو و پێیان دەگوترا (المهاجرین).

٢.خەڵکی شاری مەدینە ناویان لێنرا پشتیوانان (الانصار).

کۆچکردووەکان و پشتیوانەکانی کردە برای یەکترو، پەیمانیشی لەگەڵ جولەکەکانی مەدینە بەست کە دژایەتی یەکتر نەکەن، بەڵام جولەکەکان لەو پەیمانە پەشیمانبوونەوە.




نەخشەی دەوڵەتی ئیسلامی لەسەردەمی پێغەمبەر (د.خ)

### ڕاهێنان:

١.کۆچکەرەکان وپشتیوانەکان بوونە چی یەکتری ؟.

٢.کارەگرنگەکانی پێغەمبەر لەمەدینە بژمێرە.

٣.بروانامەی مەدینە باسی لەچی دەکرد ؟.

## سەرکەوتنی ئیسلام و ماڵئاوایی پێغەمبەر (د.خ):-

دوا بە دوای خستنی کاروباری مەدینە لە لایەن پێغەمبەر (د.خ) دیسان رووبەرووی خەڵکی مەککە بووەوە کە بەردەوام بوون لە دژایەتی کردنی موسڵمانان، بۆیە پێغەمبەر (د.خ) دەبووایە بۆ بڵاوکردنەوەی ئاینەکەی شەڕ لەگەڵ قورەیشەکانی مەککە بکات، ئەوە بوو چەند شەڕێک لە نێوان هەر دوولا روویدا، لە گرنگترین ئەو شەڕانە، شەڕی بەدر و شەڕی ئوحد و خەندەق بوو.

پاشان پێغەمبەر (د.خ) لە ساڵی(٦)کۆچی رێکەوتننامەی (حودەیبیە)یەی لەگەڵ قورەیشیەکان مۆرکرد و شەڕ راگیرا، لە ئەنجامی ئەم رێکەوتنەشدا موسڵمانەکان کەوتنە خۆ و خەڵکێکی زۆریان هێنایە سەر ئاینی خۆیان، ئەوەندەی نەبرد قورەیشەکان رێکەوتنامەکەیان شکاند، بەڵام لە کۆتاییدا موسڵمانەکان سەرکەوتن، لە ساڵی (٨) کۆچی شاری مەککەیان رزگارکرد، دانیشتوانی شارەکەش بوونە موسڵمان.دوای ئەم رووداوەش بەرەبەرە عەرەبەکانی دوورگەی عەرەبی پەیوەندیان بە پێغەمبەرەوە کرد و بوونە موسڵمان.لە(١٢)ی مانگی (ربیع الاول)ی ساڵی (١١)ی کۆچی بەرامبەر (٦٣٤)زاینی پێغەمبەر(د.خ) نەخۆش کەوت و کۆچی دوای کرد.

### راهێنان:

١.گرنگترین شەڕەکانی موسڵمانان لەگەڵ قورەیشیەکان بژمێرە.

٢.ئەنجامی رێکەوتننامەی حودەیبیە باس بکە.

٣.کێ رێکەوتننامەی حودەیبیەی شکاند؟

٤. کەی پێغەمبەر (د.خ) کۆچی دوای کرد؟.

## سەردەمی راشیدین (١١-٤٠)ی کۆچی

سەردەمی راشیدین بەو سەردەمە دەوترێت کە چوار لە هاوەڵانی پێغەمبەر (د.خ) (ئەبوبەکری صدیق، عومەری کوڕی خەتاب، عوسمانی کوڕی عەفان و عەلی کوڕی ئەبو تالیب) بەڕێوەبردنی کاری موسڵمانانیان گرتە ئەستۆی خۆیان و بوونە جێنشین(خەلیفە)ی پێغەمبەر (د.خ):.

### ١.خەلیفە ئەبوبەکری صدیق (١١-١٣)ی کۆچی:.

دوای کۆچی دوای پێغەمبەر هاوەڵەکانی لە شوێنێک کۆبوونەوە بەناوی (سەقیفەی بەنی ساعدە)

بۆ هەڵبژاردنی کەسێک تا لەجێگەی پێغەمبەر (د.خ) رابەرایەتی موسڵمانەکان بکات. ئەوەبوو دوای راوێژو پرس و راگۆڕینەوە رازیبوون لەسەر ئەوەی ئەبوبەکری صدیق ببێتە خەلیفەی پێغەمبەر.




نەخشەی دەوڵەتی ئیسلامی لە سەردەمی خەلیفەکانی راشیدین

دوای ئەوەی ئەبوبەکر کرا بە خەلیفە و جێنشینی پێغەمبەر لە مزگەوت و تاریکی پێشکەش بە موسڵمانان کرد و تیایدا رێڕەوی کاروباری خۆی دەستنیشان کرد و رایگەیاند ئەو دادپەروەرانە کار دەکاو جیاوازی لە نێوان موسڵمانان ناکات. توانی رووبەڕووی ئەو هۆزە عەرەبانە ببێتەوە کە لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە. خەلیفە ئەبوبەکر لە ساڵی ١٣کۆچی بە نەخۆشی کۆچی دوای کرد.

**زانیاری:.**

١.خەلیفە:. بەجێنشینی پێغەمبەر دەگوترێت، کە کاروباری رۆژانەی ئاینی ودنیایی

موسڵمانان رادەپەڕێنی.

٢.راشیدین:- (پێگەیشتوان و دانایان) بەهەر چوار یەکەمین خەلیفە دەگوترا، چونکە لە ڕێبازی پێغەمبەر (د.خ)لایان نەدا.

٣.شوورا:- راوێژکردن و راگۆڕینەوە لە نێوان موسڵمانان بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارو چارەسەری گیروگرفت.

## راهێنان:

١.مانای سەردەمی راشیدین روونبکەرەوە.

٢.موسڵمانەکان بۆ هەڵبژاردنی خەلیفەی پێغەمبەر لە کوێ کۆبوونەوە ؟ (مزگەوت، سقیفە بەنی ساعد، بازاڕ).

## چالاکی:

ئەمەی خوارەوە بەشێکە لە ووتارەکەی خەلیفە ئەبوبەکری صدیق):

(کەسی بەهێز و بە دەسەلات بێ هێز و بێ دەسەلاتە تاکو مافی لێ دەسەنمەوە، کەسی بێ هێز و بێ دەسەلاتیش بە هێزە تاکو مافەکەی بۆ وەردەگرمەوە).

### ٢.خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب (١٣-٢٣)کۆچی:

خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب یەکێکە لە دیارترین کەسایەتییەکانی مێژووی ئیسلامی، پێغەمبەر نازناوی (فاروق)ی پێدابوو واتا (دادپەروەر)،ئەوەی جیاوازی دەکا لە نێوان کاری رەواو ناڕەوا) لەسەردەمی ئەم خەلیفەیە چەندین کار ئەنجام دراوە، لەوانە:-

١. بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلام لە وڵاتی شام و میسر و کوردستان لەنێوان ساڵانی (١٦-٢٢)کۆچی بەتایبەتی دوای هەر دوو شەڕی (جەلەولاو نەهاوەند)، سوپای ئیسلام سوپای ساسانیەکانیان شکاند و گەیشتنە خاکی کوردان.

٢.شارەکانی (بەسرەو کوفە)لە عێراق و (فوستات)یان لە میسر دروستکرد.

٣.دیوانی دامەزراند کە ناو و مووچەی جەنگاوەرانی تێدا تۆمار کرابوو.

٤.ساڵنامەی تایبەت بە موسڵمانان دانا کە ئەویش ساڵنامەی کۆچی بوو.

لە ساڵی (٢٣)کۆچی شەهیدکرا.

### ٣.خەلیفە عوسمانی کوڕی عەفان (٢٣-٣٥)ی کۆچی:

یەکێک بوو لە هاوڕێ نزیکەکانی پێغەمبەر (د.خ)، پیاوێکی دەوڵەمەندبوو و پارەی زۆری لە پێناو ئیسلام بەخشیوە. لەسەردەمی ئەو سوپای ئیسلام بەردەوام خەریکی بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلام بوو تا گەیشتە دوورترین شوێن.

#### لە کارەگرنگەکانی خەلیفە عوسمانی کوڕی عەفان:

١. لە سەردەمی ئەودا بۆ یەکەمجار موسڵمانان (کەشتی گەلێکیان) دامەزراند تا بتوانن لە ناو دەریاش رووبەڕووی دوژمنان ببنەوە و دەست بەسەر دوورگە و ناوچە دەریاییەکاندا بگرن.

٢. تەواوکردنی کاری خەلیفە ئەبوبەکری صدیق بوو لە کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز، ئەوەبوو دانەیەکی تەواوی نووسرایەوە و لەسەر ئەویش چەند دانەیەک نووسرایەوەو رەوانەی هەرێمە جیاجیاکانی دەوڵەتی ئیسلامی کران.

#### راهێنان:

ئەو وشانەی کە هێڵیان لە ژێرە هەڵەن، راستیان بکەرەوە:-

١.خەلیفە عوسمان کەسێکی هەژاربوو.

٢.یەکێک لە کارە گرنگەکانی خەلیفە عوسمان نووسینەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر بوو.

### ٤.خەلیفە عەلی کوڕی ئەبوتالیب (٣٥-٤٠)ی کۆچی:-

ئیمام عەلی ئامۆزای پێغەمبەر بوو لەتەمەنی دە(١٠)ساڵی باوەڕی بەئیسلام هێنا، هەر لە ماڵی پێغەمبەر گەورە بووە، بۆیە سەرپەرشتی و چاودێرییەکی باشی کراوە.

خەلیفە عەلی کوڕی ئەبوتالیب فاتیمەی کچی پێغەمبەری خواستووە کە هەردوو نەوەی پێغەمبەری لێ وەپاش کەوت(حەسەن و حوسێن).

ئیمام عەلی بە زمانپاراوی و زانایی وشارەزایی و دادپەروەرو پارێزەری ماڵ و سامانی موسڵمانان ناسرابوو. بەڵام لەسەردەمی ئەو گیرگرفتی ناوەخۆ زۆر بوو هەرکەسەو دەیویست دەسەڵات بگرێتە دەست، تا کار گەیشتە بەرپابوونی شەڕ، زەرەر و زیانێکی زۆری بەهەموو خەڵک گەیاند، تەنانەت خۆشی لە ئەنجامی ئەم شەڕە لەساڵی (٤٠)ی کۆچی شەهید کرا. بەمەش سەردەمی راشیدین کۆتایی پێهات و سەردەمێکی تر لە مێژووی ئیسلامی دەستی پێکرد کە بە سەردەمی ئومەوی ناسراوە.

#### راهێنان:

١.ئیمام عەلی کچی کێی خواست بوو؟.

٢.خەلیفە عەلی کوڕی ئەبوتالیب بەچی ناسراو بوو؟.

٣. کەی سەردەمی راشیدین کۆتایی پێهات؟.

## سەردەمی ئومەوییەکان

پاش خەلیفە (عەلی کوڕی ئەبوتالیب)بنەماڵەی ئومەوییەکانن، ئەوانیش بەشێک بوون لە قورەیش دەسەڵاتیان گرتە دەست.

### معاویەی کوڕی ئەبوسفیان:

معاویەی کوڕی ئەبوسفیان یەکەمین خەلیفەی ئومەوییەکان بوو، شاری (دیمەشق)ی کردە پایتەختی خۆی، پاشان دەستی کرد بە ڕێکخستنی کاروباری دەوڵەت و چەند دیوانێکی نوێی دامەزراند، بە ناوبانگترینیان (دیوانی پۆستەو دیوانی مۆر)بوو.


(پارەی ئومەوییەکان)

لە سەردەمی ئومەوییەکاندا کاری گرنگ ئەنجامدرا، خەلیفە عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان بۆ یەکەمین جار پارەی ئیسلامی لە سکەدا و لە سەرلایەکی نووسرابوو:
(بسم اللهالرحمن الرحیم *الله احد*الله الصمد)

لە ڕووی کاری بیناسازییەوەش ئومەوییەکان هەوڵیانداوە کاری باش ئەنجام بدەن، بەتایبەتی لە سەردەمی خەلیفە وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیک چەندان مزگەوت و کۆشکو نەخۆشانە دروستکراوە، گرنگترینیان مزگەوتی گەورەی (ئومەوی)یە لە دیمەشق.


مزگەوتی گەورەی ئومەوی لەدیمەشق

**زانیاری:**

ئومەوییەکان:. چونکە باپیرەگەورەی خەلیفەکانی ئومەوی ناوی (ئومەییە) بوو.بۆیە دەوڵەتەکەشیان بەو ناوەوە ناو براوە.

دیوانی پۆستە:. بەکاری گەیاندنی نامەوە خەریک بوو.

دیوانی مۆر:. کارەکەی مۆرکردنی نامەو کاغەزی فەرمی دەوڵەت بوو.

**خەلیفە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز:**

یەکێک لە خەلیفە دیارەکانی ئومەوییەکان بوو، بە دادپەروەری و یەکسانی مامەڵە لەگەڵ خەڵک ناسرابوو، بۆیە هەندی جار پێی دەگوترێ خەلیفەی پێنجەمی راشیدین، چونکە پەیرەوی رێبازی خەلیفەکانی راشیدینی دەکرد، هەوڵی دەدا لە حوکمرانیدا بنەماکانی ئاینی ئیسلام پەیرەو بکات.دەوڵەتی ئیسلامی لە سەردەمی ئومەوییەکان زۆر فراوان بوو. ئومەوییەکان تا ساڵی(١٣٢)ی کۆچی حوکمڕانیان کرد، دواین خەلیفەیان ناوی (مەروانی کوڕی محەمەد)بوو کە لەم ساڵەدا بە دەستی عەباسییەکان لەناوچوو، بە نەمانی کۆتایی بە دەوڵەتی ئومەوییەکان هات و عەباسییەکان دەسەلاتیان گرتە دەست.

## راهێنان:

١. یەکەمین خەلیفەی ئومەوییەکان ناوی چیبوو ؟.

٢. پایتەختی دەوڵەتی ئومەوی کام شار بوو ؟.

٣. گرنگترین کارەکانی معاویە چیبوو ؟.

٤. ئەم بۆشاییانە پڕبکەرەوە:

أ. خەلیفە.........بۆ یەکەم جار پارەی ئیسلامی لێدا.
(معاویە کوڕی ئەبو سفیان، عەبدولمەلیک کوڕی مەڕوان، وەلید کوڕی عەبدولمەلیک).

ب. شاری.........پایتەختی دەوڵەتی ئومەوی بوو (دیمەشق، بەغدا، کوفە).

ج. دەوڵەتی ئومەوی لەسەر دەستی......... لەناوچوو. (راشیدین، عەباسییەکان).

٥. دواین خەلیفەی ئومەوییەکان کێبوو ؟.

٦. خەلیفە (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) بەچی ناسرابوو ؟.

٧. بۆچی بە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز دەوترا خەلیفەی پێنجەمی راشیدین ؟.

## سەردەمی عەباسییەکان (١٣٢-٦٥٦)ی کۆچی / (٧٥٠-١٢٥٨)ی زاینی

لە دوای ئومەوییەکان عەباسییەکان دەسەڵاتیان وەرگرت، ئەمانە نەوەی (عەباس)ی مامی پێغەمبەر (د.خ)بوون، ناوی دەوڵەتەکەشیان لە ناوی عەباسەوە هاتووە.




نەخشەی شاری بەغدای کۆن

یەکەم خەلیفەی عەباسییەکان ناوی (ئەبولعەباس)بوو. لە دوای ئەو (ئەبو جعفەری مەنصور)ی برای دەسەڵاتی گرتەدەست، لە گرنگترین کارەکانی خەلیفە (ئەبو جعفەری مەنصور) دروستکردنی شاری بەغدا بوو، کە بەشێوەیەکی بازنەیی بوو کردییە پایتەختی دەوڵەتی عەباسی.

### هارون ئەلڕەشید:

دوای ئەبوجەعفەری مەنصور چەند خەلیفەیەکی تر دەسەڵاتیان گرتە دەست، لەوانە هارونە ڕەشید، کە چەندان کاری گرنگی ئەنجامدا، ئەوەبوو بایەخی زۆری بە خوێندن و زانیاری دەداو هەڵسا بە دروستکردنی (بيت الحكمە/خانەی دانایی)و کتێبی زۆری تێدا کۆکردەوە، دوای هارون ئەلڕەشید(مەئمون)ی کوڕی دەسەڵاتی وەرگرتوو ئەویش زۆر هانی خوێندن و زانستی دەدا.



وێنەی شاری بەغدا

### ڕاهێنان:

ئەم دەستەواژانە هەڵەن ڕاستیان بکەرەوە:-

١.یەکەم خەلیفەی عەباسی ناوی ئەبوجەعفەری مەنصور بوو.

٢.شاری بەغدا لەلایەن خەلیفە ئەبولعەباس دروستکرا.

٣. مەئمونی کوڕی هاڕون ئەلڕەشید (بيت الحكمة)ی دامەزراند.

## بارودۆخی دەوڵەتی عەباسی:-

دەوڵەتی ئیسلامی لەسەردەمی عەباسیدا سنووری زۆر فراوانبوو، لەسەردەمی عەباسییەکاندا هەموو ئەو نەتەوانەی ببوونە موسڵمان وەک(کورد و فارس و تورک و...تد)، هەموویان رۆڵی خۆیان لە پێشخستنی دەوڵەتی ئیسلامی دەگێڕاو، هەر یەک لەو نەتەوانە لەماوەی جیاجیادا رابەرایەتی موسڵمانانیان کردووە.



نەخشەی دەوڵەتی عەباسی

## ئاوەدانکردنەوە:

عەباسییەکان گرنگی زۆریان بە ئاوەدانکردنەوە دەدا بە تایبەتی لە بواری بیناسازی کە چەندان شاریان دروستکرد کە تا ئێستا ماون، وەک شاری بەغدا وشاری (سامەڕا کە لەلایەن خەلیفە موعتەسەم دروست کراوە).


وێنەی شاری سامەڕا

دەوڵەتی ئیسلامی لەسەردەمی عەباسی هەر بەهێزی نەمایەوە بەڵکو دووچاری چەندان هێرشی دەرەکی بووە، نەتەوە موسڵمانەکان وەک (کورد، فارس، تورک)گەلێ جار بەرەنگاری هێرشەکان بوونەتەوە، بۆنموونە کاتێک (خاچ پارێزەکان) دەستیان بەسەر خاکی موسڵمانان داگرت، سەرکردەی ناوداری موسڵمانی کورد (سەلاحەدینی ئەیوبی)بە پاڵپشتی سەرکردەو هۆزی کوردی و

موسڵمان رووبەڕوویان بوونەوەو ناوچەیەکی زۆری وڵاتی فەلەستینیان لە ژێر ئەو خاچ پارێزانە دەرهێنا.

**لاوازبوونی دەوڵەتی عەباسی:-**

دەوڵەتی عەباسی رۆژ بەرۆژ بەرەو بێهێزی دەرۆیشت بە هۆی چەند هۆکارێک، گرنگترینیان بایەخ نەدانی هەندێک لە خەلیفەکانی عەباسی بە بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت و ژیانی خەڵک، تاوەکو ساڵی (٦٥٦)ی کۆچی بەرامبەر (١٢٥٨)ی زاینی لەسەر دەستی مەغۆلەکان (کەگەلێکی ئاسیایی بوون)کۆتاییان بەدەسەڵاتی عەباسییەکان هێنا.



وێنەی سەرکردەی موسڵمانی کورد (سەلاحەدینی ئەیوبی)

**زانیاری:-**

**خاچ پارێزەکان:-** بریتی بوون لەو کەسانەی کە لە ئەوروپاوە هێرشیان هێنایە سەر موسڵمانانەکان، چونکە هێمای خاچیان لەسەر جلەکانیان نەخشاندبوو.

**زانیاری:-**

سەرکردەی موسڵمانی کورد(سەلاحەدینی ئەیوبی)لە تیرەی رەوادی (رەوەند)ی سەر بەعەشیرەتی (هەزەبانی)کوردبوو. ساڵی ١١٧٢ز دەوڵەتی ئەیوبی لەمیصر دامەزراند، پاشان باکووری سودان و باکووری خۆرهەڵاتی لیبیا و ناوچەکانی یەمەن و حیجاز و شام و بەشی زۆری کوردستانی خستە پاڵ دەوڵەتەکەی. لە شەڕی بەناوبانگی حەتین (حطین) توانی بەیارمەتی هۆز و تیرەو سەرکردە کوردەکان و موسڵمانەکان سەربکەوێ بەسەر (خاچ پارێزەکان)و شارەکانی فەڵەستین یەک لەدوای یەک رزگار بکات کە گرنگترینیان (قودس) بوو.دوای مردنی سەلاحەدین ئەم دەوڵەتە لە لایەن براو برازاکانییەوە بەڕێوەدەچوو، تاساڵی (١٢٥٠)ز بەدەستی (مەمالیکەکان)رووخا.

**راهێنان:**

١.ناوی هەندێ لەو نەتەوە موسڵمانانە بژمێرە کە لەسەردەمی عەباسی رۆڵیان هەبووە.
٢.سەلاحەدینی ئەیوبی کێ بوو؟خزمەتی چی بە دەوڵەتی ئیسلامی کرد؟.
٣.لە سەردەمی عەباسییەکان گرنگی زۆریان بە ئاوەدانکردنەوەدەدا.ئەم رستەیە لێکبدەرەوە.
٤. دەوڵەتی عەباسی بەدەستی کێ رووخا؟.

## بەشی پێنجەم
# میرنشینە کوردەکان

گەلی کورد وەک گەلانی تری جیهان ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو لەسەردەمی عەباسیدا، تەنانەت هەندێک لە کوردەکان هەوڵیاندا خاوەنی حکومەتی خۆیان بن.لە ئەنجامدا چەندین میرنشین و حکومەت و دەوڵەت لەسەر خاکی کوردستان دامەزران کە هەر یەکەیان حوکمرانی ناوچەیەکی دیاریکراوی کوردستانیان دەکرد. گرنگترینیان:.

### ١ـ میرنشینی حەسنەوەیهی:.



وێنەی شاری هەمەدان
کەلەلایەن میرنشینی حەسنەوەیهی حوکمرانی کراوە

میرنشینی حەسنەوەیهی یەکێکە لەو میرنشینە کوردییانەی لە سەردەمی عەباسییەکاندا دامەزرا، حوکمرانی ناوچەی شارەزووری ئێستای سەر بە پارێزگای سلێمانیان دەکرد لەگەڵ چەند شارێکی کوردستانی ڕۆژهەلات(ئێران) بەتایبەتی شارەکانی (دینەوەر، کرمانشان، هەمەدان و نەهاوەند.ئەم میرنشینە لەسەردەمی (میر حوسێن)دامەزراوە کەسەرۆکی هۆزێک بووە بەناوی (بەرزیکانی)و دوای ئەویش میر (حەسنەوەی)کە کوڕی میرحوسێن بووە حوکمرانی کردووە و دوای ئەویش (میر بەدر) دەسەڵاتی وەرگرتووە، ئەم میرە پارەی تایبەت بە خۆی لێداوە و هەروەها چەندین کاری تری ئەنجامداوە و وەک (دروستکردنی ڕێگاو بان و پرد و مزگەوت و بایەخدان بە بازرگانی)، میر بەدر لە ساڵی ١٠١٤زاینی کۆچی دوای کردووە و کوڕەکەی (هیلال)دەسەڵاتی گرتووەتە دەست تا کۆتای هاتنی ئەم میرنشینە لەساڵی ١٠١٥زاینی.



وێنەی پارەی میر بەدر

### ٢.دەوڵەتی دۆستەکی ـ مەڕوانی

دەوڵەتی دۆستەکی ـ مەڕوانی یەکێکە لە بەناوبانگترین ئەو دەوڵەتە کوردییانەی سەردەمی عەباسییەکان دامەزرێنەری (میر بادی کوڕی دۆستەک)بووە. ئەم میرنشینە بۆ

ماوەی زیاتر لە سەد ساڵ حوکمڕانی بەشێکی زۆری کوردستانی کردووە.ئەم دەوڵەتە سەرەتا لە ناوچەی ئامەد(دیاربەکر)لە کوردستانی باکور دەرکەوت، پاشان سنورەکەی فراوان بوو، زۆر ناوچەی تری باکوری کوردستانی گرتەوە، سنوری گەیشتۆتە هەرێمی جزیرەی سەر بە (سوریای ئیستا)و شاری موسڵ لە باشووری کوردستان. زۆر شاری گرنگیان لە ژێر دەستدابووە وەک (ئامەد، میافارقین، ماردین، ئورفە، سەعرەد، بەدلیس و جزیرێ بۆتان و چەندان شاری تر).دوای (میر باد کوڕی دۆستەک) میر (ئەبوعەلی کوڕی مەڕوان) دەسەڵاتی گرتە دەست لە دوای ئەویش براکەی کەناوی (سەعید)بوو دەسەڵاتی دەوڵەتەکەی بەڕێوە دەبرد، لە دوای ئەویش چەندان میری تر کاروباری دەوڵەتیان بردووە بەڕێوە.



وینەی پردێک لەسەردەمی میر بەدر دروستکراوە



شوێنەواری کۆنی دەوڵەتی دۆستەکی ـ مەڕوانی

لە میرە بەناوبانگەکانی دەوڵەتی دۆستەکی (میر ئەحمەد کوڕی مەڕوان)بووە، خەلیفەی عەباسی نازناوی (نصرالدولە)ی پێبەخشیوە، میر ئەحمەد لەساڵی (١٠٦١زایینی) کۆچی دوای کردووە، دەوڵەتەکەشیان بە دەستی سەلجوقە تورکەکان لەساڵی (١٠٩٦ زایینی) رووخاوە.

## کارەکانی دەوڵەتی دۆستەکی (مەڕوانی):-



وێنەی دروشمی دەوڵەتی دۆستەکی ـ مەروانی

لە سەردەمی دەوڵەتی دۆستەکی ـ مەروانی زۆر بایەخ دراوە بەکاری ئاوەدانکردنەوە و دروستکردنی رێگا و و بان و پردو مزگەوت و شوورە بۆ پاراستنی شارەکان لە هێرشی دەرەکی. جگە لە لێدانی سکەی تایبەت بەدەوڵەتی دۆستەکی، میرەکان ناوی خۆیان لە سەردەنوسی، خەلکەکشی بەکاری کشتوکاڵ و ئاژەڵداری خەریک بوون. دەوڵەتی دۆستەکی خاوەنی دروشمی تایبەت بەخۆیان بووینە، کە وینەی شێرێکە.

## راهێنان:

١.کێ؟ میر نشینی حەسنەوەیهی دامەزراند.

٢.سنوری دەسەلاتی میر نشینی حەسنەوەیهی تاکوێی دەگرتەوە ؟.

٣.گرنگترین کارەکانی میر بەدر چیبوو ؟.

٤.ئەم وشانەی هێلیان بە ژێردا هاتووە هەلەن، راستیان بکەرەوە:.

ا.دەولەتی دۆستکی ـ مەروانی سەرەتا لە دهۆک دامەزرا.

ب.دامەزرێنەری دەولەتی دۆستەکی ـ مەروانی ناوی ئەبو عەلی بوو.

ج.دەولەتی دۆستەکی لەسەردەمی ئومەوییەکان دامەزرا.

٥.وەلامی راست هەلبژێرە:.

أ.دوای میرباد میر (ئەبو عەلی، سەعید، ئەحمەد)دەسەلاتی گرتە دەست.

ب.(نصرالدوله) نازناوی میر(باد، ئەحمەد، سەعید)بوو.

ج.میر ئەحمەد کەسێکی (ئاشتیخواز، شەڕخواز)بوو.



لایەکی شوورای ئامەد کە مەروانییەکان بەشداربوون لە دروستکردنی

## نیشتمان

نیشتمان زەوییەکی (شوێنێکی)سنووردارە، خۆمان ودایک و باوک وکەس و کارمان تێیدا لە دایکبووین ولەسەری دەژین. هەریەک لە ئێمە لە خێزانێک و لە ناو ماڵێکدا دەژیت، بە کۆمەڵە ماڵێک گەڕەکێک یاگوندێک پێکدێت.لە چەند گەڕەکیک شارێک یا شارۆچکەیەک پیکدیت، گوندو شاریش پارچە زەوییەکی سنوردار ودیاریکراوی خۆیان هەیە کە هاووڵاتیانی ئەو دەڤەرە لەسەری دەژین.نیشتمانیش بەناوی گەلەکەیەوە دەناسرێت و ناودەبرێت، وەکو (کوردستان).

کەواتە ئەو شوێنەی کە خۆمان و دایک و باوک و کەس و کارمان تێیدا لەدایکبووین و لەسەری دەژین و پەروەردەکراوین پێی دەوترێت (نیشتمان).

گەلی کوردیش وەکو گەلانی تری جیهان نیشتمانی خۆی هەیە لەسەری ژیاوەو دەژیت، لەکاتێکدا سوودی لە خاک و سامانەکەی وەرگرتووە و خۆشی و ناخۆشی ژیانی لێچەشتووە، لە هەمان کاتیشدا قوربانی بۆ داوە وخزمەتی زۆریشی کردووە، مێژوو لە لاپەڕەکانی خۆی چەندین داستان و نەبەردی بۆ تۆمارکردووە، کە چۆن رۆڵەکانی خوێن و فرمێسک و ئارەقەی تێکەڵاو کردووە بۆ پاراستنی ئەم خاکە خۆشەویستە. نیشتمان بەها و جوانی و خۆشەویستییەکەی بێ وێنەیە، بۆیە هەردەم لەسەر زارو لەبەر دڵانە، کەم کەسیش هەیە خۆشەویستی وڵاتەکەی لەناو دڵدا نەبێت، هەر ئەو هەست و خۆشەویستیەیە پێی دەوترێت (هاونیشتمانیبوون).



پارکی ئازادی-سلێمانی

### هاونیشتمانیبوون:ـ

بریتییە لەهەستکردن بەلێپرسینەوە بەو ئەرک و مافانەی کە هاووڵاتی هەیەتی بەرامبەر بە گەل و نیشتمانەکەی، یەکێک لە ئەرکەکانی بریتییە لە بەرپرسیاریەتیی لە ئەستۆ گرتنی بۆ پاراستنی هەموو ئەو خزمەتگوزاریانەی کە هەموو کەسیک سوودیان لێدەبینێت، چ ئەوانەی میری دروستی کردوون، یا ئەوانەی سەرمایەدارەکان بنیاتی دەنێن وەک:ـ

١.ئاوی پاکی خواردنەوە.

٢.رێگاکانی هاتووچۆ.

٣.ئاوەڕۆکان.

٤.كارەبا.
٥.ناوەندەکانی خوێندن و تەندروستی.
٦.باخچە گشتییەکان.
٧.دامودەزگا میرییەکان(حکومییەکان) بۆ راپەڕاندنی کاروباری هاوولاتیان.وەک (دادگا، بنکەی پۆلیس، شارەوانی....تد)

## راهێنان:

١.ئەم بۆشاییانە پڕ بکەرەوە:
أ.نیشتمان زەوییەکی..............خۆمان و کەس و کارمان تێیدا لە............بووین.
ب.کوردستان بەناوی گەلەکەیەتی کە............. ە.
ج.هاونیشتمانیبوون بریتییە...........بەلێپرسینەوە بەرامبەر بەگەل و نیشتمان.
٢.ناوی ئەو خزمەتگوزارییە گرنگانە بژمێرە کە رۆژانە سوودیان لێدەبینیت.



### ١.ئاوی پاکی خواردنەوە:-

چۆن بوونەوەرەکان ناتوانن بەبێ هەوا و خۆراک بژین، بەبێ ئاویش ناتوانن بژین، کەواتە (ئاو) بنچینەیەکە لەبنچینە گرنگەکانی بەردەوامبوونی ژیان.ئێمەی مرۆڤیش وەکو بوونەوەرێکی سەر ئەم خاکە ناتوانین بەبێ ئاو بژین.

**سوودەکانی ئاو:-** ئاو تەنها بۆ خواردنەوە بەکارنایەت، بەڵکو بۆ پاک و خاوین راگرتن، چێشت لێنان، کشتوکاڵ و پیشەسازی، کارگەکان و بۆ ئاودانی باخچە گشتییەکان بەکاردێت...تد.

**سەرچاوەکانی ئاوی خواردنەوە:-**

ئەو ئاوەی کە ئێستا تۆ لە شارو شارۆچکەو گوندەکان بەکاری دەهێنیت، لەچەند سەرچاوەیەکەوە دەستمان دەکەوێت.

ئاوی شارەکان بەهۆی بیرو پرۆژەکانی راکێشانی ئاوەوە دابین دەکرێت. هەرچی ئاوی گوندەکانیشە زۆربەی لەرێگای بیر وکانی و سەرچاوەو چەم و روبارەکانەوە دەگاتە دەست.

ئەم سامانە نیشتمانییە گرنگە کە یەکێکە لە پێویستییە هەرە گرنگەکانی ژیانمان و



سەرمایەکی ئێجگار زۆری بۆ تەرخانکراوە، بۆئەوەی هاونیشتمانییان سوودی لێوەرگرن.

بۆنمونە لەشاری (هەولێر)بێجگە لەوبیرە ئیرتوازیانە کەلەناو جەرگەی شاردا لێدراون و پشت بەئاوی ژێرزەوی دەبەستن، پرۆژەی ئاوی (ئیفراز)کەلە زێی گەورەوە بەبۆری بەدرێژایی چەندین کیلۆمەتر ئاوی پاک دەگەیەنێتە ناو شار، چارەسەری گرفتی کەم ئاوی شارەکەی کردووە.بۆشاری سلێمانیش پرۆژەیەکی مەزن جێبەجێکراوە ئاوی پاک لەدەریاچەی دوکانەوە بەهۆی لولەکێشەوە ئاو دەگەیەنێتە هاوولاتیانی شارەکەوە، بەشێوەیەک چارەسەری کێشەی کەم ئاوی لە سلێمانی کردووە، بۆ شاری دهۆکیش بەهەمان شێوە حکوومەت پرۆژەی گەیاندنی ئاوی(چەم بەرەکات و خەراب دێم کەلە بەنداوی موسڵ)ەوە بەهۆی لولەکێشەوە بۆ هاوولاتیانی شارەکە جێبەجێکردووە، کە توانیویە گرفتی کەم ئاوی لەشارەکە چارەسەربکات.

بۆ دێهاتەکانیش کەمتەرخەمی نەکراوە، زۆربەی گوندەکان لەسەردەمی رژێمی بەعس خاپوور کرابوون، لەدوای راپەڕین سەرلەنوێ ئاوەدانکراونەتەوە و پرۆژەی ئاوی پاکیان بۆ دروستکراوە، چ بەهۆی لێدانی بیری ئیرتوازی یان لەرێگای پرۆژەی بچووک و تانکەری گەڕۆکی ئاوەوە رۆژانە ئاویان پێدەگات، چونکە لە ئەنجامی وشکە ساڵییەوە لەم ساڵانەی دواییدا زۆربەی سەرچاوە ئاوییەکان بە کانی و چەمەکانەوە کەم ئاو بوونە یان وشکبوون.

**سەرچاوە ئاساییەکانی ئاوی گوندەکان هەندێ جار بەهۆی ئەم هۆکارانەی خوارەوە پیس دەبێت:۔**



١. بەکارهێنانی قڕکەرە کیمیاوییەکان بۆ لەناوبردنی مێرووڵەی سەر بەروبوومە کشتوکاڵییەکان.

٢. فڕێدانی پاشەڕۆ و لاشەی ئاژەڵی مردار.

٣. رژانی ئاوی پیسی ماڵان بۆ ناو سەرچاوەی ئاوی گوندەکان.



٤. بەکارهێنانی ئامان و دەبەو کەرەستەی پیس لە گواستنەوەی ئاو.

ئەمانە هۆکاری پیسبوونی سەرچاوەی ئاوی خواردنەوەی **دێهاتەکانن، بۆ پاراستنیشی لەپیسبوون پێویستە ئەم رێگایانە بگرینە بەر:۔**



١. پارێزگاری کردنی چەم و کانیاوەکان لەپاشەڕۆی ئاژەڵ.
٢. دوورخستنەوەی ڕژانی ئاوی پیسی ماڵان بۆ ناو سەرچاوەکان.
٣. ئاوی خواردنەوە لە تانکی پاک و داخراودا هەڵبگیرێت.
٤. کوڵاندنی ئاوی خواردنەوە یان پاکردنەوەی (تعقیم) لە میکرۆب.
٥. ئەو کەرەستانەی کە بۆ ئاوخواردنەوە بەکاردەهێنرێت پێویستە لەجێگای پاکدا دابنرێت، چونکە ئاوی پیس سەرچاوەی بڵاوبوونەوەی زۆربەی نەخۆشییەکانە.

**ڕاهێنان:**

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەرەوە:
١. ئەو هۆکارانە چین کە دەبنە هۆی پیسبوونی ئاوی گوندەکان ؟
٢. چۆن ئاوی گوندەکان لە مەترسی پیسبوون دەپارێزیت ؟

### بەفیڕۆنەدانی سامانی ئاو:





بۆ ئەوەی ئەم سامانە گرنگە لەدەست نەدەین و سوودی باشتری لێببینین، پێویستە ڕێگا نەدەین ئاو بەفیڕۆ بڕوات، دەبێ خۆمان و ئەندامانی خێزانەکەمان ڕابهێنین و ئاگاداریان بکەینەوە کە ئەو سامانە موڵکی هەموومانە پاراستنی ئەرکی سەرشانی هەموو تاکەکانی ئەم کۆمەڵگەیە، وەکو لەپێشەوە ئاماژەی پێدراوە، ئاو سەرچاوەی ژیانەو خۆشگوزەرانی بۆ هەموو بونەوەرێک دەرەخسێنێ، کەواتە دەبێ چەند هەنگاوێک بۆ پاراستنی ئاو بگرینەبەر کە بریتین لە:-
١. نابێ ئاو لەپێویستی خۆمان زیاتر بەکاربهێنین.
٢. خوشک و برا بچوکەکانمان ڕابهێنین کەوا یاری بەئاوی ماڵەوە نەکەن، چونکە ئاوێکی زۆر بەفیڕۆ دەڕوات.
٣. دڵنیابوون لە گرتنەوەی شێرەی (بەلوعە) ئاوەکە لەدوای دەم وچاو و ددان شوشتن، هەروەها هەرکارێکی تر.



٤. سۆندە و ترومپای ئاو بەکارمەهێنە بۆناومالّ و ئۆتۆمبیل شوشتن.

٥. سەوزەو میوە لە دەفرێکی کراوەدا بشۆ، مەیخەرە ژێر شێرەی ئاوەکە.

٦. لەهەر شوێنێک چاومان بەبۆریەکی شکاو کەوت پێویستە راستەوخۆ ئاگاداری لایەنی پەیوەندیدار بکەینەوە بۆچاکردنەوەی، تاوەکو:.

أ.ئاو بگاتە هەموو لایەک بەیەکسانی.

ب. لەوانەیە ئاوی پیس لەگەلّ ئاوی خواردنەوە تێکەلاّو ببێت، ئەمەش دەبێتە هۆی بلاوبوونەوەی نەخۆشی جۆراو جۆر.

٧- نابێت بێ پرسی فەرمانگەکانی ئاو بۆ مالّەکان رابکێشرێت، چونکە دەرەنجامی نادروستی لێدەبێتەوە، وەک لەپێشتر باسکرا.

**زانیاری :-**



ئاو سامانێکی نیشتیمانی زۆر گرینگە، ئەمڕۆ بۆتە سەرچاوەی کێشەو ناکۆکیەکانی نێوان ولاّتان. وەک کێشەی نێوان (عێراق-ئێران) (عێراق-توركيا) (عێراق-سوريا).

**راهێنان:**

**پ١:نیشانەی ( √ )بۆ ڕاستەکان و نیشانەی (x) بۆ چەوتەکان دابنێ.**

أ.هەموو هەفتەیەک ئۆتۆمبێلەکەمان بەئاوی مالّەوە دەشۆم.

ب.ئەگەر بینیم بۆری ئاوی کۆلاّنەکەمان شکاوە، یەکسەر ئاگاداری فەرمانگەی ئاو دەکەمەوە.

ج.هاوینان لە ئاوی کانی گوندەکەمان مەلە دەکەم.

د.پاشەڕۆی ئاژەلّ وزبلّ وخاشاک دەخەمە ئاوی چەمی گوندەکەمان.

ه.بۆ پاک کردنەوەی، سەوزەو میوە ناخەمە بەر ئاوی بۆری مالّەوە.

پ٢.چۆن پارێزگاری لە سامانی ئاوی پاک دەکەیت ؟

## ٢.شەقام (ڕێگای هاتووچۆ):-







یەکێک لەدیاردە هەرەجوان و پڕسوودەکانی شارستانییەت (ڕێگاکانی هاتووچۆیە)، ئاستی پێشکەوتنی هەر وڵاتێک بەندە بەبوونی ڕێگاکانی هاتووچۆ، چونکە ئەم خزمەتگوزارییە ئەرکو ماندوبوون کەم دەکاتەوە، ڕێگای دوور و ناخۆش نزیک دەکاتەوە. کاتێ سەیری شارەکانی وڵاتەکەمان دەکەین، دەبینین شەقامی فراوان و گەورە بەناو شارەکاندا تێدەپەڕێت و ناوەوەی شەقامەکانیش بەباخچەی سەوزو دڵڕفێن ڕازاوەتەوە، هەست بەئارامی و خۆشی دەکەیت.

شەقامەکان لەقوڕو ئاوی پیس و کۆسپە ـ تاسە دەمانپارێزێت بەئاسانی دەگەینە جێگای مەبەست.

ئەو شوێنانەی بێ شەقامن یا وەکو پێویست نییە (چاڵ وگۆماوی لەسەرە یان کۆن و تەسکن)هاتووچۆیان تێدا ئاسایی نییە.

شەقامەکان سوودیان زۆرە بێجگە لە خێراکردنی گواستنەوە و دوورکەوتنەوە لە مەترسی گیانی و مادی کە لە شەقامە ناڕێکەکان دێتە ڕێگامان، نرخی کەلوپەلیش دادەبەزێنێت و بارگرانی لەسەر ژیانی هاووڵاتیان کەمدەکاتەوە، بۆیە پێویستە بیانپارێزین.

### ئەو هەوڵانە چین بۆپارێزگاری کردنی شەقامەکان دەدرێن:-

١.نابێ شەقامەکان بەبێ پرسی شارەوانی بۆ هەر مەبەستێک بێت هەڵکەنین، چ بۆ ڕاکێشانی ئاوی خواردنەوە بێت یا بۆ ئاوی پیسیماڵەوە، تاوەکو لەدوای تەواوکردنی کارەکە بەزووترین کات چاکبکرێتەوە.

٢.ئاوی پیسی ماڵان نابێت بڕژێنە سەر شەقامەکان، چونکە دواتر کاریگەری دەردەکەوێت و تووشی چاڵیان دەکات.

٣.کەلوپەلی زیادەی خانوو دروستکردن فڕێنەدرێتە سەرشەقامەکان، چونکە دەبێتە هۆی رێگا گرتن و بێزارکردنی هاووڵاتیان و ناشیرین کردنی سروشتی شارەکان وتێکدانی شەقامەکان.

بۆ هاتووچۆی ئاسایی هاووڵاتیان هەردەم میری هەوڵدەدات خۆشگوزەرانی بۆ دانیشتوان مسۆگەربکات و بەئاسانی رۆژانە بگەنە سەرکارەکانیان، بێجگە لەدروستکردنی شەقام و شۆستە و تونێل و بەرزە پرد ، کەسانێکی لەخۆبردووی لەسەر شەقام و چوارڕیانەکان داناوە تاوەکو هاووڵاتیان لە کارەساتی هاتووچۆ بپارێزن، ئەو کەسانە (پۆلیسی هاتووچۆن)فریشتەن بۆپاراستنی گیان و ماڵی هاووڵاتیان، شەو و رۆژ لە خزمەتدان.ئێمەش دەبێ رێزیان لێبگرین و گوێڕایەڵیان بین، سەرپێچی رێنماییەکانیان نەکەین، تاوەکو لەگیانی خۆمان و هەموولایەک دڵنیابین.

**زانیاری:-**

بۆ ئەوەی باخ و ناوەوەی شەقامەکان هەردەم رازاوە بێت، دەست بۆ گوڵ نابەین و لقی دارو درەخت ناشکێنین.



**زانیاری:-**

-بۆ پەیڕەوکردنی رێکخستنی هاتووچۆ ئامێرێک لەچوار ریانەکان دانراوە، پێی دەوترێت (ترافیک لایت)، کە گلۆپە سوورەکەی داگیرسا ، نیشانەیە بۆ وەستان، سەوزەکەشی نیشانەیە بۆ تێپەڕبوون، لە زەردەکەشی دەبێ هەڵوەستە بکەین (بۆ ئاگادار کردنەوەیە).

-لەکاتی پەڕینەوە لە شەقامەکان گوێڕایەڵی رێنماییەکانی پۆلیسی هاتووچۆ دەبم، بۆئەوەی گیانم لە مەترسی بپارێزم.



### ٣- ئاوەڕۆ (زێراب):-

خزمەتگوزارییەکی تر کە هاونیشتمانیان سوودی لێدەبینن و ژینگەش بەپاک و خاوێنی رادەگرێت ئاوی پیسی ماڵان و دەزگاکان رێکدەخات و رێگا نادات لە ناو کۆڵان و شەقامەکان بڵاو ببێتەوە.

ژینگەی پاک پەیوەندی بەرادەی هوشیاری و تەندروستی و هەستی هاونیشتمانی بوون هەیە.

هەستکردن بە پارێزگاریکردنی موڵکی گشتی نیشانەی دڵسۆزی و پەرەسەندنی هەستی



نیشتمان پەروەرییە، مرۆڤی هوشیار و شارستانی شەرم دەکات کاتێ ببینێت کۆڵان وشەقامەکانیان پیسە، ئازاری پێوە دەبینێت، چونکە ئاستی دواکەوتووی ئەوی لێ دەردەکەوێت.



**بۆ پاراستنی ئاوەڕۆییەکان پێویستە ئەم کارانە بکەین تاوەکو شارەکەمان هەردەم پاک و خاوێن بێت:.**

زبڵ وخاشاک لە دەبە و قوتووی بەتاڵی ساردی و نایلۆن و کاغەز فڕێ نەدەینە سەر شەقام و ناو ئاوەڕۆکان، چونکە لەئەنجامدا کۆدەبێتەوەو دەبێتە هۆی گیرانی ئاوەڕۆکان، بەتایبەتی لەکاتی باران باریندا، شەقام و کۆڵانەکان تووشی ئاو هەستان و لافاو دەکات و زیانی زۆر بە هاووڵاتیان دەگەیەنێت.



**ئەو دیاردەیە ساڵانە لە وەرزی زستاندا هاووڵاتیان توشی زەرەرو زیانێکی مادی و گیانی زۆر دەکات.**

پاک راگرتنی شارەکەمان تەنها ئەرکی شارەوانی نییە، بەڵکو لەسەر هەموولایەک پێویستە هاوکاری و هەماهەنگی دەزگاکانی شارەوانی بکەین و هەرکەسێ لە لایەن خۆیەوە رێنماییەکانی شارەوانی و مەرجەکانی پاک و خاوێنی جێبەجێبکات، بگرە هانی ئەوکەسانەش بدرێت کە پەیوەست نابن بە رێنماییەکان، تاوەکو هاووڵاتیانی تریش چاومان لێبکەن.












### ٤.کارەبـــــا:ـ

مرۆڤ دەیان ساڵە ئامێرەکانی کارەبای ناسیوە.کارەبا لەسەرەتای داهێنانیدا تەنها بۆ پێویستی رووناک کردنەوە بەکار هاتووە، لەسەدەی بیستەمدا گەشەی زۆری پێدرا و لەچرا (گلۆپ)ەوە داهێنان دوای داهێنان کۆمەڵێک ئامێری تازە خرایە بواری ئیشکردنەوە، تاوەکو ئەمڕۆش داهێنانی ئامێرە جیاجیاکان بەردەوامە بۆدابینکردنی خۆشگوزەرانی و ئاسوودەکی مرۆڤ.

کارەبا یەکێکە لە پێویستییە هەرەگرنگەکانی مرۆڤ، ئەستەمە ئەمڕۆ بتوانێ بەبێ ئەم خزمەتگوزارییە ژیانێکی ئاسوودە ببرێتەسەر، چونکە ئەمڕۆ هەر بۆ رووناک کردنەوە کارەبا بەکار نایەت، بەڵکو جۆرەها ئامێری نوێی هاتۆتەکایەوە وەکو (ئاوگەرمکەرەوە- گیزەر، تەباخی کارەبای، سۆپا - هیتەر، ئامێری شۆرین و وشککردنەوەی جل، ساردکەرەوە، سەهۆڵگر، خۆراک بەستە(مجمدة) و سپلیت و ئوتوو...تد.

لە ئەنجامی ئەو داهێنە مەزنانە کە لە بواری کارەبا بەدەستهاتووە، بازاڕەکان پڕبوون لە ئامێری کارەبای جۆراو جۆر، هاووڵاتیان دەتوانن بەئاسانی بەدەستی بهێنن، بەتایبەتی ئەو کەسانەی باری گوزەرانیان باشە.

زانیاری:ـ

وزەی کارەبا لەچەند سەرچاوەیەکەوە بەرهەم دەهێنرێت، وەک:ـ

**أ.کارۆئاوی:ـ** کە لە ڕێگای ئاوەوە بەرهەم دەهێنرێت.

**ب.کارۆگەرمی(گەرمە کارەبا ):ـ** بەهۆی بەکارهێنانی سوتەمەنی وەکو (نەوت و بەروبوومەکانی)و سەرچاوەکانی تری وزە (خۆر، ئەتۆم...تد.)بەرهەم دەهێنرێت.



بەنداو بۆ بەرهەمهێنانی وزەی کارەبا

زیادبوونی داواکاری لە بەکارهێنانی ئامێرەکانی کارەبا ، ئەرکێکی زۆر دەخاتە سەر دەزگاکانی بەرهەمهێنانی کارەبا ، کە پێویستی بە بەرهەمهێنانی بڕی وزەی کارەبا زۆرتر دەبێت. ئەم بەرهەمهێنانەش پێویستی بە سەرمایەیەکی زۆرو دەستی کرێکاری شارەزا هەیە.

لەوەرزەکانی هاوین و زستاندا هاوولاتیان ئامێرەکانی فێنک کردنەوەو گەرمکردنەوە بەشێوەیەکی نائاسایی بەکار دەهێنن، کە کاردەکاتە سەر ڕێژەی



بەرهەمهێنان، لەوانەیە هەندێ جار لە توانای دەزگای بەرهەمهێنان نەبێت ئەم زیادەڕۆییە چارە بکات. ناچار کار بۆ کەمکردنەوەی ماوەی پێدانی وزەی کارەبا دەکات، ئەمەشیان کار دەکاتە سەر ژیانی ڕۆژانەی هاونیشتمانیان.

بۆ ئەوەی بڕی بەکاربردنی وزەی کارەبا کەمبکرێتەوە، پێویستە هەندێ هەنگاو بنرێت بۆئەوەی پارێزگاری لەم سامانە نیشتمانییە بکرێت:.

١. کەمکردنەوەی بەکارهێنانی وزەی کارەبا، لە بواری پیشەسازی، بازرگانی، ماڵەوە ودامو دەزگاگشتییەکان... تد.

٢. وشیارکردنەوەی هاووڵاتیان، چ لە قوتابخانە و خوێندنگاکان، چ لە شوێنەگشتییەکان وەک مزگەوت و بازاڕەکان.... تد. بۆ ئەوەی دەست بە بەکارهێنانی بڕی وزەی کارەباوە بگیرێت و بە پێی پێویست بەکار بهێنرێت.

٣. داخستنی دەرگا و پەنجەرەکان بەشێوەیەکی ڕێک و بەردەوام نەخرێنە سەرپشت، چونکە دەرگا کردنەوەی بەردەوام پێویستی بە وزەی زۆرتر دەبێت.

٤. چاودێری کردنی بەردەوامی ئامێرەکانی کارەبا لەچۆنییەتی کارکردنی دا.

٥. بەکارنەهێنانی ئامێری کارەبای هەمەجۆر لەیەک کاتدا، باشتر وایە تەنها ئامێری پێویست لەشوێنی پێویست بەکاربهێنرێت.

٦. دڵنیابوون لە کوژاندنەوەی سەرجەم ئامێرە کارەباییەکان لە دامودەزگاکان لە دوای کۆتایهاتنی دەوامی فەرمی ڕۆژانە.



**زانیاری:-**



-بەکارهێنانی ئامێرەکان لەکاتی پێویستدا تەنها وزەی بەکارهێنراو کەمناکاتەوە، بەڵکو تەمەنی ئامێرەکانیش درێژ دەکات.

-کوژاندنەوەی گلۆپێک لە هەرماڵێک، کاریگەری لەسەر زیادکردنی ماوەی پێدانی بڕی کارەبا دەبێت.

-کەمکردنەوەی گلۆپێکی ماڵەکەت، رووناک کردنەوەی ماڵێکی ترە.





**راهێنان:**

**:نیشانەی ( √ )بۆ ڕاستەکان و نیشانەی (x) بۆ چەوتەکان دابنێ.**

١.بۆ ئەوەی وزەی کارەبای زۆر بەکار نەهێنین، ئاگاداری ماڵەوەمان دەکەمەوە کە ئامێر و گلۆپی زیادە دانەگیرسێنن.

٢.لەکاتی یاریکردندا لەگەڵ هاوڕێکانم سەری زێرابەکان لانادەم.

٣.پاشماوە و کەلوپەلی خانو دروستکردن دەخەینە سەر شەقامەکان.

٤. زبڵ و خاشاک ناخەمە ناو ئاوەڕۆکان.

## ٥ .دامودەزگا خزمەتگوزارییە گشتییەکان:.



لە نێوان ئەو دامو دەزگا خزمەتگوزاریانە کە (قوتابخانە، خوێندنگا ، نەخۆشخانە، دەزگاو دامەزراوەکانی میری و باخچە گشتییەکان....تد)، دەگرێتەوە، هەریەکە بۆمەبەستێکی تایبەت ئامادەکراوە، بۆ ئەوەی خزمەت بە هاوولاتیان بکات و ژیانێکی ئاسوودەو خۆشگوزەران بۆ سەرجەم ئەندامانی کۆمەڵگە مسۆگەربکات.



بۆیە لەسەر هەر تاکێکی ئەو کۆمەڵگەیە پێویستە بایەخی ئەو دەسکەوتانە بەرز رابگرێت و پارێزگاریان لێبکات، بەم شێوەی خوارەوە:.

١.کەلوپەلی ناو قوتابخانە، نەخۆشخانە، باخچە گشتییەکان و سەرجەم دامودەزگاکان بپارێزین، دار و دیوارەکانیان و شەقامەکان پاک رابگرین.

٢.لە کاتی سەردانی باخچە گشتییەکان پێویستە پارێزگاری لە پاک و خاوێنییان بکەین و دار و درەخت و گوڵەکان دەستکاری نەکەین، چونکە مانەوەیان سوودی زۆرترە، ژینگەش خۆش و جوانتر دەکات، ئەمە لەلایەک، لەلایەکی تر سوودی بۆ تەندروستی و لایەنی دەروونیشی دەبێت.



٣.رەچاوی رێنماییەکانی دامو دەزگا خزمەتگوزاریەکان پێویستە، بۆ ئەوەی کاری رۆژانەی هاوولاتیان بەشێوەیەکی ئاسایی بەرێوەبچێت.

٤.دامو دەزگا گشتییەکان بۆ مەبەستی تایبەتی بەکار نەهێنرێت، کەببێتە هۆی بێزارکردنی دانیشتوان و زیان گەیاندن بەبەرژەوەندی گشتی.







## راهێنان:

١. ئەم بۆشاییانە بە وشەی گونجاو پڕبکەرەوە:

أ. دامو دەزگا گشتییەکان بریتین لە..........و..........، ..........و....تد.

ب. پێویستە پارێزگاری لە..........و..........و.......... قوتابخانەکەمان بکەین.

٢. لەکاتی سەردانمان بۆ هەر دامودەزگایەکی گشتی پێویستە ڕەچاوی ڕێنماییەکانیان بکەین، تۆش بەکورتی لەسەر ئەم دەستەواژەیە بدوێ.



### زانیاری:

نەخۆشخانەکان، دەزگایەکی گرنگی کۆمەڵگەیە، هاونیشتمانیان لە هەر جۆرە نەخۆشییەک چارەسەردەکات، بۆیە پارێزگاری کردنی ئەرکی سەرشانمانە.

### چالاکی:

کاتێ بەناو گۆڕەپانی قوتابخانەکەت دا هاتووچۆ دەکەیت، پارچە کاغەزی فڕێدراو هەڵگرەوە، بیخەرە ناو شوێنی کۆکردنەوەی خۆڵ وخاشاک.بەم کارەت ئەرکێکی نیشتمانیت رادەپەڕێنیت.

## ئەگەر تەقەمەنیت بینی چی دەکەیت؟

١. بە هیچ شێوەیەك لێی نزیك مەبەوە .

٢ .هیچ شتێکی تێ مەگرە وەك(بەرد،دار،...).

٣. کەسانی گەورە (باوك – برا – ئەنجوومەن – مامۆستا) ئاگادار بکەوە سەبارەت بە بوونی ئەو مەترسییە .

## چی دەکەیت ئەگەر کەسێکت بینی دەستکاری مین یان تەقەمەنی دەکات؟

١– ئەگەر کەسێکت بینی دەستکاری شتێکی نامۆ دەکات، پێی بڵێ: بوەستە لەوانەیە بتەقێتەوە.

٢– ئەگەر بە قسەی نەکردیت و لەسەر کارەکەی بەردەوام بوو ، پێویستە ڕابکەیت، بۆ ئەوەی دوور بکەویتەوە وخۆت نەخەیتە مەترسییەوە .

٣– کەسێکی گەورە (باوك – برا – مامۆستا – ئەنجوومەن) ئاگادار بکەوە بۆ ئەنجامدانی کاری پێویست.







## پێرست